




ناوی کتێب: گەشتێك بە ئەمریکای لاتین دا

بابەت: گەشتنامە

نووسەر: د. سالار باسیرە

مونتاژ: یانەی قەڵەم

هەڵەچن: یانەی قەڵەم

تیراژ: 500 دانە

چاپ: یەکەم-سلێمانی 2014

چاپخانە:  یاد ، بازاڕی سۆز- نهۆمی سێیەم

نرخ:2000  دینار

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (1116)ی ساڵی 2014 پێ دراوە.

د. سالار باسیرە

# گەشتێك بە ئەمریكای لاتین دا

**(نیكاراگوا وەك نموونە)**

سلێمانی 2014



لە چاپكراوەكانی پڕۆژەی كتێبی یانەی قەڵەم
زنجیرەی ژمارە (137)



سەرپەرشتیاری پڕۆژە: جەبار سابیر
جێگری سەرپەرشتیار: ئارام سدیق

ناونیشان: یانەی قەڵەم، سلێمانی، سابوونكەران، بینای هەورامان نهۆمی

ئەم کتێبە پێشکەشە بەو مرۆڤ و گەلانەی هەرگیز چەوساندنەوەو کۆیلایەتی قبوڵ ناکەن و لە دژی ڕادەپەڕن ..

پێشکەشە بە گەلی نیکاراگوا



# ناوەڕۆك


پێشەکی

دەربارەی نیکاراگوا

بەرنامەی گەشتەکەمان

سەرەتای گەشتەکە

گەیشتنمان بۆ نیکاراگوا

ڕۆژی هەینی 1988/7/15

ژیان لە گوندەکە

ئاوهەوای وڵات

گەیشتنمان بۆ گوندەکەو دابەشبوونمان بەسەر ماڵاندا

گەیشتنمان بۆ شاری خویگالپە (Juigalpa)

یادکردنەوەی شۆڕش هەر ساڵەی لە شارێك

دووبارە گەڕانەوە بۆ گوندەکە

7/23 ماتەمینی بۆ چوار شەهیدەکە

گەشەکردنی پەیوەندیەکانم لەگەڵ شۆڕشگێڕەکان

ڕۆژی هەینی 7/22 گوێزامەوە بۆ لای خێزانێکی تر

گفتۆگۆ لەگەڵ ڕێکخراوەکان

گفتوگۆ لەگەڵ ڕێکخراوی جەماوەریی (CDS)

دەربارەی خێزانی دووهەم من لایان ژیام

ژیانێکی بە ئازار

تراژیدیای ماڵە هاوسێکەمان

هەژاری و برسێتی





بارەگای ڕێکخراوی ژنان (Amnlaae)

سەردانی ڕۆژنامەی باریکادای بەرەی ساندینیستی

ڕژێمی سۆمۆزا / ڕیفۆرمی کشتوکاڵی

دوای شۆڕشێکی خوێناوی ساندینیستەکان لە هەڵبژاردندا دۆڕان

ئەمریکای لاتین

گرنگی ئەمریکای ناوەڕاست و ناوچەی کاریبی بۆ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا

گرنگی ئەمریکای لاتین بۆ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا

کۆچی لاتینەکان بۆ ئەوروپاو مێژووی کۆیلایەتی

گەشتی بەرازیل

گەشتەکەم بۆ کـــوبا

کردنەوەی مۆزەخانەی شۆڕش لە کوردستان

درەختی ریقنە

کارلۆس فۆنسێکا، هاورێکەی گیڤارا

سەرنجە گشتییەکانم لە کوبا

کاسترۆ و کەناڵە تەلەڤزیۆنییەکانی کوبا

# پێشەکی

لە وڵاتێکی پڕ شەڕ و جەنگ و چەوساندنەوە چاوم کردەوەو تێیدا گەورە بووم. کاتێکیش ڕۆیشتمە ئەوروپا بەردەوام بووم لە خەبات و تێکۆشانی سیاسیم بۆ گەلەکەم و پشتیوانی بزووتنەوە ڕزگاریخوازەکانی گەلانیش بووم. بەلامەوە گرنگ بوو گەشتی وڵاتێکی "جیهانی سێ" بکەم شۆڕشی تێدا بوبێت و سەرکەوتووش بووبێت. دەمویست سۆڵیداریم لەگەڵ شۆڕشەکەیان ئەگەر کەمیش بێت. جگە لەوە مەبەستم بوو لێکۆڵینەوە لە شۆڕشی ئەو وڵاتە بکەم. گەشتی چەند دەوڵەتێکی ئەمریکای ناوەڕاستم کرد وەك کۆستاریکا، هۆندوراس، پەنەما، کوباو نیکاراگوا، بەڵام چەقی مانەوەو لێکۆڵینەوەکەم لە نیکاراگوا بوو لەو وڵاتەی "جیهانی سێ" کە بە شۆڕش ڕژێمێکی دیکتاتۆری ڕووخاند، وڵاتێك وەك بەشێك لە ئەمریکای لاتین کە بە کیشوەری شۆڕش و برسێتی ناسراوە.

دوای گەڕانەوەم لەو کیشوەرە، کە نیوەی گۆی زەوی دوورە لە کوردستانەوە بریارمدا گەشتەکەم بکەمە کتێبێك. ئەوا ساڵانێکی زۆر بەسەر ئەو گەشتەم تێپەریوەو ئەو کتێبەی من لە بەرنامەمدا بوو. سەرقاڵی خوێندنی زانکۆ بووم، دواتر بەهۆی تراژیدیای خێزانییەوە وزەکانم کزبوون بۆ زۆر شتی تری ژیانم. ڕووداوەکانی جەنگی کەنداو، ڕاپەڕینەکەی باشوری کوردستان دەستی پێکرد و سەرقاڵی ئەم تراژیدیایەو دواتر گەرانەوەی



چەند جارەم بۆ کوردستان و بریاڕی ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەم لەسەر تراژیدیای ئەنفال و کردنی بە بەرنامەی تەلەڤزیۆن و نووسینی نامیلکەیەك. بەردەوام سەرقاڵی وڵاتەکەم بووم. دواتر ئەنجامدانی نامەی دوکتۆرا. ئەو کات بە پێنج زنجیرە دەربارەی ئەم گەشتەی نیکاراگوا لە کوردستانی نوێ دا نوسیم. پێشکەش کردنی بە چەند زنجیرەیەك لە کەناڵەکانی میدیا تیڤی و هەروەها لە کەنالی گەلی کوردستان. بەڵام ئێستە، کە دەمەوێ بیکەمە کتێبێك واهەست دەکەم هەروەك دوێنێ لەم گەشتە گەڕابێتمەوە چونکە ژیانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی ئەو وڵات و ناوچەیە گۆڕانێکی لەسەرخۆی بەخۆیەوە بینیوە. جیاوازیە گەورەکە لەوەدایە من بەتەمەنتر بووم، خەڵکانی ئەوێ پیرتر بوون، بەڵام توانای نووسینەوەو فیکرو شیکارییەکانم کامڵتر بووە. بەهیوای ئەوەی بۆ خوێنەرانی وڵاتەکەم ئەم گەشت و گێڕانەوەیەم بە سوود بێت بەتایبەت، کە خۆم لەنێو ڕووداوەکاندا بووم و سەرنج و بەسەرهاتەکانی ڕۆژانەم هەمووی لەو وڵاتە نوسیوەتەوە. بەم کتێبەدا بینیم کات چەندە زوو دەروات لە ژیانی مرۆڤدا. ئەم کتێبە تەنیا گێڕانەوەی گەشتێکی لێکۆڵینەوە نییە، بەڵکو زانیاری زۆریش ئەدات بە خوێنەر دەربارەی نیکاراگواو ئەمریکای لاتین هەروەها سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو کۆلۆنیالیزم و دەسەڵاتی خێزان و بنەماڵەکان لە "جیهانی سێ"، هەربۆیە بە سوودە بۆ خەڵکی وڵاتەکەی خۆشم، چونکە کۆمەڵێك دیاردەی هاوتەریب هەن لە نێوانیاندا.

dr.salarbasira@hotmail.com

## دەربارەی نیکاراگوا

نیکاراگوا کەوتۆتە ناوەڕاستی کیشوەری ئەمریکاو سەرو و خواروی ئەم کیشوەرە بەیەکترەوە گرێدەدات. لە باکوور سنووری بە هۆندوراسەوە هەیە بەدرێژایی 922 کم. لە باشور کۆستاریکا بە درێژایی 309 کم. لە رۆژئاوا ئۆقیانووسی ئەتلەسی و لە رۆژهەڵاتیش ناوچەی کاریبی سنووریەتی. لە گەورەترین شارەکانی بریتین لە ماناگوای پایتەخت 1. 140 000 ملیۆن دانیشتوانییەتی. لیۆن دووەم گەورەترین شار 150 هەزار کەسە. ژمارەی دانیشتوانی ئەمرۆی نیکاراگوا بریتیە لە 5. 727. 707 ملیۆن کەس کەمێك زیاتر لە دانیشتوانی هەرێمی کوردستان. روبەری نیکاراگوا بریتییە لە 129. 494 هەزار کم دووجا. لە 15. 9. 1821 ەوە نیکاراگوا سەربەخۆیی خۆی وەرگرتوەو ئەو رۆژە بۆتە بۆنەی فەرمی ساڵانەی وڵات. نیکاراگوا بە درێژی ئۆقیانووسی ئەتلەسی بە زنجیرەیەك بورکانی چالاکدا دەڕوات هەربۆیە ئەو وڵاتە بە وڵاتی هەزار بورکانەکان ناسراوە.





یەکێك لە بورکانە چالاکەکانی نیکاراگوا / رژێمی سۆمۆزا زۆرێك لە چالاکوانەکانی ئۆپۆزیسۆنی لە هەلیکۆپتەرەوە فرێ داوەتە ناوی / وێنەکە لە لایەن نووسەرەوە گیراوە

گرنگترین شوێنەکانی دانیشتوان کەوتۆتە سەر درێژایی ئۆقیانووسی ئەتلەسی لەکاتێکدا ناوچەکانی رۆژهەڵات و باشور دانیشتوانێکی کەم و تەنکی تێدایە. نیکاراگوا خاوەنی دوو زێیە بە ناوی زێی نیکاراگوا لە باشوری رۆژئاوا لەگەڵ چەند دورگەیەك، هەروەها زێی ماناگوا لە بەشی رۆژئاوای وڵات. دوای داگیرکردنی نیکاراگوا لە لایەن ئیسپانییەکانەوە لە سالی 1530 توانییان ئاینی مەسیحی / مەزهەبی کاسۆلیکی زال بکەن بەسەر هندیە سورەکان و دانیشتوانی وڵاتەکەدا. بەڵام چەندبارە راپەرین دژ

به ئیسپانییەکان بەرپادەکرا. بەم هۆیەوە ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی نیکاراگوا بۆ وڵاتی پیرۆ کۆچ پێکراو لە بارودۆخێکی قورسی نامرۆڤانەدا دەبوایە ژیان بەسەر بەرن و کاریان پێدەکردن و زۆریان لێدەمردن. ئەمڕۆکە 80٪ی خەڵکی نیکاراگوا مەسیحی مەزهەب کاسۆلیکن. ئیسپانی زمانی فەرمییەو لە لایەن 97٪ی دانیشتوانەوە قسەی پێدەکرێ بەهۆی ئەوەی لە سەرەتادا کۆلۆنی ئیسپانیا بووەو ئەم زمانە کرایە زمانی فەرمی و وەك زمانی دایکی لێهاتووە. جگە لە بەرازیل کە زمانی پورتوغالی قسە دەکەن چونکە کۆلۆنی پورتوغال بوو چیتر هەموو ئەمریکای لاتین زمانی ئیسپانی قسە دەکەن. ناودەبرێ بە ئەمریکای لاتین چونکە زمانی ئیسپانی و پورتوغالی لاتینییە. زمانی تر بریتییە لە ئینگلیزەکانی ناوچەی کاریبی لە نیکاراگوا کەوتوونەتە بەشی ڕۆژهەڵاتی وڵات جگە لەوە هندیە سوورەکانیش زمانی خۆیان هەیە.






## نیکاراگوا و هاوسێکانی

لە خواروی ریۆسان خوان ئەو زێیەی پێی دەوترێ زێی نیکاراگوا و کەوتۆتە ڕۆژئاوای نیکاراگوا بۆ هاتوچۆی پاپۆڕ گرنگە. لەدوای سەربەخۆبوونی نیکاراگوا لە ئیسپانیا لە 1821 بەریتانیا خواستی بوو کاریگەریی خۆی بەسەر ناوچەی کاریبی بسەپێنێت. هاوسێیەتی جوگرافی ئەمریکای ناوەڕاست و ناوچەی کاریبی بە ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاوە هۆکارێکی هەڵگیرسانی شەڕی زلهێزەکانی ئەو سەردەمانە بوو لە پێناوی بەرژەوەندیەکانیاندا. هەر دوو ساڵ دوای سەربەخۆیی نیکاراگوا سەرۆك کۆماری ئەمریکا James monroe لە ساڵی 1823 ئەو دروشمەی بەرزکردەوە: "ئەمریکا هی ئەمریکیەکانە". ئەمریکا هی ئەمریکیەکانە بە واتا ماف ئەمریکای سەروو بەسەر سەرجەمی کیشوەرەکەدا. گشت چالاکییەکانی ئەمریکای سەروو لە خزمەتی ئەو ئامانجەدا دەسەڵاتی خۆی بەسەر ئەم بەشی ناوچەی جیهانەدا بسەپێنێ بەهەر نرخێك بووە. لە ناکۆکیدا لەگەڵ بەریتانیا سەبارەت بە ڕێگای هاتوچۆی پاپۆڕ لە ئۆقیانووسەکان هەردوو دەوڵەتی ئەمریکای سەروو بەریتانیا بۆ ئەم مەبەستە لە ساڵی 1850 ڕێکەوتنامەی Clayton Bouler واژۆ دەکەن، کە ئەو مافە بەر حکومەتی ئەمریکای سەروو کەوت بە گرێدانی

نیکاراگواش بە ناوچەی دەسەڵاتی حکومەتی ئەمریکاوە ئیتر لەو کاتەوە مێژووی نەتەوەی نیکاراگوا دیاریکرا، بەڵام لە دژی داگیرکردنی ئەم وڵاتە بزووتنەوەی دژ بە ئیمپریالیزم گەشەی کرد، کە خەسڵەتێکی نەتەوەیی و نیشتیمانی بەخۆوە گرت، کە هەتا ڕۆژی ئەمڕۆ بە کاریگەرییەوە کەم یان زۆر لە قۆناغە جیاجیاکاندا خۆی دەنوێنێ.



**نیکاراگوا لەسەر نەخشەی کیشوەری ئەمریکا**



## بەرنامەی گەشتەکەمان

بۆ ئەو گەشتەی نیکاراگوا گروپێکی 14 کەسی بووین. ئەم جۆرە گروپە هاوکارە نێودەوڵەتیە پێیان دەوترێ بریگادیست. بەرێگای ڕێکخراوێکی ئەلمانییەوە بۆ هاوکاری کردنی شۆڕش و گەلی نیگاراگوا ڕێکخرابوو. 6 ژن و 8 پیاو بووین. باشی ئەم ڕێکخستنە لەم خاڵانەی خوارەوەدا بوو: گەشتەکە بە بەرنامە ڕێکخرابوو. ئەو گوندە دیاری کرابوو کە ئێمە بۆی دەچووین و بۆ ئەو چەند مانگە دەماینەوە تێیدا بەناوی ئەل ڕۆزاریۆ کە دەکەوێتە خواروی نیکاراگوا لە نێوان ئۆقیانووسی ئارام و زێی نیکاراگوا.



**خانوویەکی گوندی ئەل ڕۆزاریۆ**

هەروەها دیدارو سەردانی کۆمەڵێك لە ڕێکخراوە سیاسی و کۆمەڵایەتی و سەندیکاو بەشەکانی میدیاکان ڕێکخرابوو بۆمان. کەسێکی سەر بە ڕێکخراوەکە لە نیکاراگوا کاری دەکرد کە هەم شارەزای جوگرافی هەبوو هەروەها زمانی ئیسپانی باش دەزانی. دوای ئەو سێ مانگەی مانەوەمان لەو گوندە چیتر هەر یەکێك لە ئێمە ئازاد بووین چ شێوەیەکی تر بە مانەوەمان ئەدەین لەو وڵاتە. من نزیکەی پێنج مانگ مامەوە لە ناوەراستی ئەمریکا. گەشتێکی زۆرم کرد بە ناوچەکانی تری نیکاراگوا. دواتر گەشتی هۆندوراس، کۆستاریکاو پەنامام کردو لە گەرانەوەشمدا مانگ و هەفتەیەك لە کوبا مامەوەو گەشتێکی سەرتاسەری دورگەکەم کرد. لە کاتی مانەوەکەی نیکاراگوام ویستم بڕۆم بۆ سەلفادۆر بەڵام ئامۆژگاریی کرام دەست لەم ویستەم هەڵبگرم چونکە شەڕ لە نێوان پارتیزانەکان و ڕژێمی سەلفادۆر گەرم بوو، هەروەها دوو کەسی خەڵکی سویسرا رفێندرابوو کە وەك من بۆ هاوکاری شۆڕش هاتبوونە نیکاراگوا.



## سەرەتای گەشتەکە

لە ڕۆژی سێ شەمە 1988/7/12 لە ڕۆژهەڵاتی بەرلینەوە بە فڕۆکەیەکی کۆبایی کەوتینە ڕێ بەرەو هاڤانای پایتەختی کوبا. فڕۆکەکەمان لە بری (1) ی پاش نیوەڕۆ لە کاتژمێر 15 .20 خولەکی شەو فڕی.




لە دورگەی Neufundland لە کەنەدا نیشتینەوە بۆ بەنزین تێکردن. کەمێك لە ترانزێت کاتمان بەسەربرد. نزیکەی دوانزە کاتژمێر بە ئاسمانەوە بووین بۆ هاڤانا. جیاوازی کات لە نێوان بەرلین و هاڤانا (6) کاتژمێرە. لە 3. 30 خولەکی بەیانی لە هاڤانا دابەزین. فڕۆکەخانەکە گەورە نەبوو. پاسەوانی چەکدار نابینی. ڕێژەی ژن لە کاروباری فڕۆکەخانەکە زۆر بوو. بەگشتی بەرگی سەربازییان لەبەردابوو. سەبارەت بە کەشوهەوای نێو فڕۆکەخانەکە هەرچەندە جاروبار هەوایەکی فێنك دەهات بەڵام ئاو و هەوای نێو هۆلی ترانزێتەکە گەرم بوو. بیناکە کۆن بوو. دیوارو بنمیچەکانی پاك

نەبوون. پێویستی بە نوێکردنەوە هەبوو. ئەو کاتە پانکەی تیا نەبوو. پانکەکان بە ئاسمانەوە مابوونەوەو دەزگای کارپێکردنی پێوە نەبوو. لەبەر گەرمی و بێ هەوایی ئەچوینە خوارەوە لەبەردەمی دەرگاکە هەوا وەرگرین بەڵام دەیانوت چوونە دەرەوە قەدەغەیە. زۆرێك ئەوانەی لە فرۆکەخانەکە کاریان دەکرد رەش پێست بوون. ئەم فرۆکەخانەیە دیارە کاتی خۆی شوێنێکی سەربازی بووەو لە قەڵای سەربازیش دەچوو. سەرقالی دیوار دروستکردن و بەرزکردنەوەو گەورەکردنی قەڵاکانی بوون. ئەمانتوانی بچینە ئوتێلێکی نێو شار بەڵام 33 کم دوور بوو لە فرۆکەخانەکەو خۆمان دەبوایە پارەی تەکسی بدەین نزیکەی 25 دۆلاری دەکرد و تەنها بۆ شەش کاتژمێریش بوو. وتمان کاتەکە ئەوەندە ناهێنێ و لێرە ئەمێنینەوە. بەسەر سەکۆکانی نێو فرۆکەخانەکە بەتەنەکە ئاویان ڕشتبوو بۆئەوەی هەوای ساردکەرەوەکان لێی بدات، کە جاروبار لە بنمیچەکەوە دەهاتە خوارێ بۆ فێنك کردنەوی ئاوەکە. فرۆکە زۆر کەم دەرۆیشت و دەنیشتەوە. مانەوە بۆ زیاتر لە دوو رۆژ دەبوایە 40 مارکی ئەلمانی بدەین و ئوتێلی دوو شەوت دەستەبەر کردبێت و پارەکەی بە دراوی قورس بدەیت. دەبوایە لە (11)ی نیوەرۆ بکەوینە ڕێ بەرەو ماناگوای پایتەختی نیکاراگوا. لە رۆژی 7/13 لەهاڤاناوە بە فرۆکەیەکی CUBANA AIR کەوتینە ڕێ بەرەو ماناگوا. دوای پازدە خولەك کێشەی تەکنیکی رووبەڕووی فرۆکەکە بۆوە. بەناچاری گەراینەوە بۆ هاڤانا. دوای نزیکەی (2) کاتژمێر چاوەروانی فرۆکەکەیان چاك کردەوەو جارێکی تر کەوتینەوە رێگا. فرۆکەخانەی ماناگوا لەوەی هاڤانا خۆشترو ڕێکو پێکترو فێنکتر بوو.



# گەیشتنمان بۆ نیکاراگوا

لە فرۆکەخانەی ماناگوا دەبوایە شەست دۆلار بگۆڕینەوە بەرامبەر 19.500 کۆردوبای (دراوی) نیکاراگوا. مایکە ژنە ئەڵمانە رێکخەرەکەمان لە فرۆکەخانە چاوەڕێی دەکردین. لای رێکخەرێکی تری ئەلمان (شتێفان) لە ماناگوا لاماندا بۆ باسکردنی پرۆگرامی داهاتوومان. دوای ئەوە چووین بۆ شارۆچکەی Jinotepe و هەندێ لە شتومەکەکانمان لەوێ دانا. لێرە ماریۆن (جێگری پارێزگاری Jinotepe ) داوەتی هەموومانی کرد لە چێشتخانەیەك بۆ نانخواردن. دوای ئەوە بە گەڵابەیەك کە لە ماناگوا هاتبوون گوێزراینەوە ئەو دێیەی مەبەستمان بوو، نزیکەی (4) کم دوورە لە Jinotepe وە) بە ناوی El rozario.




**نووسەر لای چەپی وێنەکە**



له (خونتا) بارەگای دێکە لاماندا. دابەشکراین بەسەر خێزانەکانی دێکە. ئامادەیی خۆیان نیشاندابوو بۆ وەرگرتنمان و پێشتر لە خونتا چاوەڕێیان دەکردین. لە ڕۆژی 5 شەممە خاتوو مایکە هات بۆ بارەگای دێکەو بەگشتی دەربارەی زۆر شت قسەی کرد و ئامۆژگاری لە هەندێ رووەوە پێداین کە ئێمە پیاو و ژن چۆن هەڵسوکەوت بکەین دەربارەی نەریت و بیرکردنەوەی گەلی نیکاراگوا لە شارو لە لادێ. لە ڕۆژی هەینی کاتژمێر (2)ی پاش نیوەڕۆ ئەبوایە (ماریۆن) پارێزگاری دێکە بهاتایەو لەگەڵیا دەربارەی بارودۆخی سیاسی نیکاراگوا بەگشتی قسە بکەین، بەڵام نەیتوانی بێت لەبری ئەو (خوان) هات. ئەو کەسەی ئێمەی لەگەڵ مایکە لە ماناگوا هێنا بۆ دێکە. خوان ئەندامێکی چالاکی (FSLN) بوو/ بەرەی ساندینستی رزگاریخوازی



شۆڕشی نیکاراگوا. جگە لە کاری ئیداری کاروباری شۆڕشیشی ئەبرد بەڕێوە. دانیشتنەکەمان لە قوتابخانەی دێکە ئەنجامدا. مایکە قسەکانی خوانی بۆ وەردەگێڕاینە سەر زمانی ئەڵمانی و بە پێچەوانەشەوە.

## ڕۆژی هەینی 1988/7/15

بارەگای دێکە شوێنی کارکردنی خوان بوو هەروەها لێپرسراوی کاروباری دەرەوەش بوو ئەوانەی نێوان دێکەو دەرەوە. خەڵکی دێکەو جوتیارەکان خۆشیان دەویست. خوانی تەمەن 30 سال لە زمانیان تێئەگەیشت و ئەیزانی چۆن مامەلەی لەگەڵ دەکردن. دوو منداڵی بێ دایك و باوکیشی گرتبووە خۆی و بەخێوی دەکردن، خۆشیان منداڵێکیان هەبوو.

وتەکانی خوان: "لەدوای سەرکەوتنی شۆڕش، سۆمۆسیستەکان (رژێمی سۆمۆزا) ئەو پارانەی لە کاسەی دەوڵەت دابوو هەمویان لەگەڵ خۆیاندا بردە دەرەوەو دزی. دەوڵەت سەرمایەی نەمابوو. بارودۆخی ئابووری و ژێرخانی ئابووری تەواو تێکچوو بوو، قوربانییەکی زۆر درابوو. کارگەکان پارەی کرێکارەکانیان نەئەدا. لەبەر زۆری رێژەی نەخوێندەواری ئەوانەی مامۆستاو خوێندەوار بوون چوونە شاخ و لادێکان بۆئەوەی نەخوێندواری کەم بکەنەوە. لە پرۆسەیەکی زەمەنیدا نەخوێندەواری لە رێژەی 70٪ هاتە سەر 12٪ . رێکخراوە جەماوەرییەکانی وەکو CDS رۆڵی گرنگیان دەبینی تێیدا. هەر ئەوانەش بوون لە کاتی شۆڕشدا هوشیاری سیاسی زۆریان هەبوو، خۆیان دروستکردبو. لە دوای شۆڕشیش لە کاروبارەکانی ناو

جەماوەردا ڕۆڵی گرنگیان بینیوە. 1982 حکومەتی ئەمریکی (ئەمان ناوی دەبەن بە ئەمریکای سەروو) ڕاکردووەکانی ڕژێمی سۆمۆزای لە Miami گرتە خۆی و پشتگیری کردن بە ئامانجی لە ناوبردنی دەسەڵاتی گەل لە نیکاراگوا[1]. لە هۆندوراسەوە کەوتنە دروستکردنی دەزگای سەربازی و کۆمەڵێك چەکداریان پێکەوەنا (کۆنتراکان). ئەم کۆنترایانە لە ڕووی چەك و پارەوە پشتگیری ئەمریکای سەروویان هەبوو. لە کاتێکدا لە نیکاراگوا باری ئابووری تێکچوبو کۆنتراکان توانیان ناوچە بەپیت و بەرەکەتەکان بۆنموونە ناوچەکانی ڕواندنی قاوە تێکبدەن. زۆربەی زۆری ناوچە بەپیت و بەرەکەتەکان بۆ کشتوکاڵ و رواندنی قاوە لەسەرو، سەروی ڕۆژهەڵاتی نیکاراگوایە، کە کۆنتراکان ئۆپەراسیۆنی سەربازییان تێدا ئەنجامداوە. (25٪ی داهاتی نیکاراگوا لەسەر بەروبوومی قاوە بوو".

کۆنتراکان لە هۆندوراس و کۆستاریکاوە ئۆپەراسیۆنی سەربازییان ئەنجام ئەدا بۆ سەر خاکی نیکاراگوا بەڵام زۆربەی زۆری هێرشەکانیان لە

[1]) کلانی سۆمۆزا خێزانی بنەماڵەیەك بوو کە سیاسەتی نیکاراگوای لە 1934-1979 بە میتۆدی زەبروزەنگی دیکتاتۆرانە فەرمانرەوایی کردوە. بە واتا خێزانی بنەماڵەیەك 35 سال فەرمانرەوایی ئەو ولاتەی کردوە بە سەرۆکایەتی Anastasio Somoza Debayle . لە مێژووی فەرمانرەویی خۆیدا ئەم خێزانی دەسەلاتە تەقلیدیە سەروەت و سامانێکی بێشوماری خڕکردەوە. بەشێکی زۆری لەسەر حیسابی کوێرەوەری گەل بە شێوەیەك کە لە کۆتایی سالی 1970 زال ببوو بەسەر ئابوری نیکاراگوا. لە سالی 1979 بە رێگای راپەرین و شۆرشەوە ئەم رژێم و خێزانە لە دەسەلات روخێندراو لە ولات دەرکرا.



هۆندوراسەوە بوو کەمتر لە کۆستاریکاوە. ڕامۆن ژمارەی ئەم بەکرێگیراوانەی بە نزیکەی 25 هەزار کەس مەزەندە دەکرد. لە ناو کۆنتراکاندا خەڵکی نیکاراگوایشی تێدابوو. بەشێکی ئەمانە پەیامی هەڵەیان ئەدرایە، خواردن و پارەی باشیان ئەدرایە یان بەزۆرو بە هەرەشەی لەناوبردنی کەسوکاریان ئەیان بردن. نزیکەی 5 هەزار لە هندیە سوورەکانیان بەم جۆرە بردبوو. گیروگرفتی نێوان هندیە سورەکان و حکومەتی ساندینستی گیروگرفتێکی تایبەتە. حکومەت لێبوردنی گشتی بۆ دەرکردن بگەڕێنەوەو لە کێڵگەکانیاندا ( کۆئۆپەرەتیڤەکاندا) کاربکەن، زەوی وەربگرن و لە کارگەکاندا کاربکەن. ڕامۆن بیرورای وابوو هندیە سورەکان بە هۆی نەزانی و تێنەگەشتویانەوە چوونەتە ئەویَ لای دوژمنانی شۆڕش. هەتا ئەو کاتەی منی لێبووم نزیکەی 1000 لەم کۆنترایانە ئازادکران لە بەندیخانە. ئامانجی کۆنتراکان کە سەرچاوەکەیان حکومەتی ئەمریکا بوو تێکدانی ئەم وڵاتە بوو. بۆ بۆردومانکردنی فڕۆکەخانەو ناوچە گرنگەکان بوو، بۆ بایکۆتکردنی ئابووری بوو. تەکنەلۆژیای نیکاراگوا بەستراوە بە تەکنەلۆژیای ئەمریکاوە کە ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ڕژێمی سۆمۆزا. چارەسەرکردن و ئاسایکردنەوەی ئەم گیروگرفتە هەروا ئاسان نییە.

# ژیان لە گوندەکە

دووبارە بگەڕێمەوە بۆ ژیانی ئێمەی بریگادیستەکان لە گوندەکەمان. جل شتن بە دەست بوو. تایت نەبوو. لەو سابوونە گەورانەی جارانی لای خۆمان هەبوو کە بۆنێکی ناخۆشی هەبوو، بۆنەکەش بەدەستەوە ئەنووساو درەنگ ئەڕۆیشت. لەوێش کێشەی ئاو هەبوو. ڕۆژێك ئاو هەبوو ڕۆژانی دواتر نەبوو یان ڕۆژی دوو کاتژمێرێك هەبوو. کارەباش بە هەمیشەیی نەبوو. بۆ مێش دەرکردن دەرمانیان نەبوو. کارێکی گرانبوو چونکە هەر 12مانگەکە مێش و مێشوولە هەیە. دووکەڵیان دەکرد بەناو هۆڵەکانا بۆ دەرکردنی مێش و مەگەز. هەر بۆیەش دیوارەکانی پیس و ڕەش بوون و بۆیاخ کردنیشیان هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێ. ئەو دووکەڵەش بێگومان خراپە بۆ تەندروستی.



**موبەقی ئەو ماڵەی لێی دەژیام**



خەڵکەکە تەسلیم بەو واقعی ژیانە ببوون چونکە تواناکان کەمبوو. پارە نەبوو، وڵات هەژارە. دیاربوو لەسەر ئەم ژیانە کوێرەوەریە ڕاهاتبوون، بەناچاری چونکە هەروا ژیاون و تەنیا ئەو جیهانەی خۆیان ئەناسن و هیچیتر هەروەك ژیان هەمیشە هەر بەم جۆرە بوبێت. خواردن کەمبوو. گۆشت زۆر لوکسوس بوو. کە هاوڕێیەکی ئەلمانم ئەیووت من گۆشت ناخۆم و رووەکیم زۆر سەیریان لێدەهات. ئایا مرۆڤ چۆن گۆشتی بدەنێ نایخوات. لەو گوندە هەفتەی جارێك دەیانتوانی گۆشت بخۆن و ئەویش مانگایەکی پیریان سەردەبڕی بە کۆمەڵێك خێزانەوە. منداڵەکەیان دەهاتە لام وەك ئەوەی بلێت هەوالێکی خۆشی پێیەو پێی دەوتم سبەینێ گۆشت دەخۆین. کە ڕۆشتمە ئەو وڵاتە نانی پانی وەك ئەوەی لای خۆمانم بینی پێیان دەوت تۆرتیا، دڵخۆشبووم پێی بەڵام کە خواردم بۆ من زۆر ناخۆش بوو چونکە لە گەنمەشامی دروستکرابوو نەك لە ئارد.



## ئاو و هەوای وڵات

ئێمە لە کەژی باران باریندا رۆیشتینە ئەوێ. لەو وڵاتە زستان و هاوین نییە وەك لای خۆمان. چوار کەژ نییە. نیکاراگوا زیاتر کەوتۆتە سەر خەتی ئیستیوا . 6 مانگ باران دەبارێ و 6 مانگ وشکە. هاوینی لای خۆمان لەوێ کەژی باران بارینە. هەورێکی ڕەشی دەهێناو لە کاتێکی کورتدا دەستیدەکرد بە باران بارینێکی زۆر بەخوڕ. پلەی گەرما لە نێوان 30-35 پلە ئەبێت، بەڵام ئەوەی کە منی بێتاقەت دەکرد ئەوە بوو کە ئاووهەوا شێدار بوو، خۆم دەشت، بەڵام لە ماوەی چەند خولەکێکدا کراسەکەم بە گیانمدا دەنووسا. ناوچە بەرزەکان فێنکتر بوو. لە کاتی باران باریندا کۆڵانەکان ئەبونە قوڕو منداڵ بەپێی پەتی بەناو ئاو و قوڕدا دەڕۆیشتن. لە سەقفی ماڵەکەوە کە بەچینکۆ دروستکرابوون باران دەهاتە ژورەوە. لەبەر هەوا هاتنە ژورەوە نێوان چینکۆی سەربان و دیوارەکە بۆش بوو. لە شەودا لە کاتی باران باریندا بەتانییان ئەدا بەسەر دەموچاویاندا بۆ ئەوەی پرپیشکی بارانیان بەر نەکەوێت.



## گەیشتنمان بۆ گوندەکەو دابەشبوونمان بەسەر ماڵاندا

پارێزگاری دێکە داوای لێبوردنی لە ئێمەی بریگادیستەکان کرد گەر بارودۆخی ژیانمان زۆر باش نەبێت لەوێ بەڵام ئێمە دەمانویست وەك ئەوان بژین و خۆمانیان لەگەڵ بگونجێنین و لە ناخۆشییەکانی ژیانیان تێبگەین. بۆ من بێگومان ئەزمونێکی گرنگ بوو لە ژیانمدا. بۆ رێزلێنان لە ئێمە چەند مامۆستایەك و کۆمەڵێك لە قوتابی قوتابخانەی دێکەیان بە جلی تایبەتەوە هێنابوو بۆ بارەگای دێکە کە ملپێچەکانیان ئاڵای ساندینیستەکان بوو (ڕەش و سوور). وتاری خۆیان خوێندەوەو بەدروشمی بژی سەربەستی و پاشان وتارەکەیان بەسرووودی نیشتیمانی کۆتایی پێهێنا. سێ جۆر سەماو هەڵپەڕکێی میلییان پێشکەش کردین. ئێمەش وتاری خۆمان خوێندەوە کە بە ئیسپانی ئامادەمان کردبوو. دروشمێکی گەورەمان هەڵواسی کە بریتی بوو لە دوو ڕەنگ نیوەی ڕش و نیوەی سوور (ئاڵای نیکاراگوا).

لە بەشی سەرەوە بە ئەڵمانی لێمان نووسیبوو: Solidaritat ist die Zertlichkeit der völker "هاوکاریی خۆشەویستیی گەلانە". ئەوە وتەی وەزیری رۆشنبیرییان بوو Ernerto Kardinal. لە بەشی خوارەوەی ئاڵاکە هەمان نووسین بە زمانی ئیسپانی تاکو ئەوانیش لێی تێبگەن. شەوەکەش تەرخانکرا بۆ مۆسیقاو ئاهەنگ و هەڵپەڕکێی میللی کە بەبۆنەی ئێمەوە سازکرابوو. ژمارەیەکی بەرچاوی دانیشتوانی گوندەکە هاتبوون و تا درەنگانێکی شەو مانەوە. من لە رۆژی 7/18 نامەی هەموو بریگادیستەکانم وەرگرت و بردم

بۆ شاری Jiontepe بیدەم بە خاتوو (Meike) کە ئەویش بیدات بەو کەسەی لە رۆژی پێنج شەممە لە ماناگواوە ئەگەڕایەوە بۆ ئەڵمانیا. تکام لە Meike کرد بەڵکو لەگەڵ کاربەدەستە حیزبییەکانی ناوچەی Jiontepe قسە بکات بۆ ڕێکخستنی گەشتێك بۆمان بۆ شاری (Juigalpa). پاس پەیداکردن و ئامرازی هاتووچۆ ئاسان نەبوو بەتایبەتی بۆ ڕۆژێکی ئاوها کە نۆیەمین ساڵیادی شۆڕش بوو. لە کاتژمێر 2.30 کەوتینە ڕێ. نزیکەی 8-9 کوڕو کچی دێکەش لەگەڵمان هاتن کە ئێمە داوەتمان کردن بۆ ئەو گەشتە. لە ناو پاسەکەدا سروودی نیشتیمانی و شۆڕشگێڕییان بۆ ئەوتین.



هەرچەندە دووری ڕێگاکە نزیکەی (180- 200) کیلۆمەتر ئەبێت بەڵام لەبەر خراپی ڕێگاکە بە نزیکەی (4.5) کاتژمێر گەیشتین. ڕۆژێك پێشتر کەوتینە ڕێگا بۆ ئەوەی بە دڵنیاییەوە بگەینە شوێنی مەبەست. بەو



شارۆچکەیەدا ڕۆیشتین کە سەرۆکی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نیکاراگوا ساندینۆی تێدا لە دایکبووە، هەروەها ئەو گۆڕستانەی ساندینۆی وەك سیمبوڵ تێدا نێژراوە. دەگێڕنەوە ساندینۆ کە شەهیدکرا لاشەکەی گورگ و حەیوان خواردوویەتی و لە شوێنێکی نادیار فڕێدرابوو. لە شارەکان و شەقامەکان دروشم و ئاڵای (FSLN)ی لێهەڵواسرابوون. ڕەبایەی سەربازی زۆربوو بەتایبەتی لەو شەقامە سەرەکیانەی بەرەو شاری (juigalpa ) ئەڕۆیشتن. شوێنی یادکردنەوەی نۆیەمین ساڵی شۆڕش. گروپی بچووکی سەرباز هەبوو کە زۆرجار ژمارەیان لە (2-4) کەس تێپەڕ نەئەبوو. دەبابەو مودەرەعەو چەکی گەورە بەدەگمەن ئەبینرا. بەڵام کۆمەڵی بچووکی چەکداری سەرباز شێوەی گروپی پارتیزانی بەخۆیەوە ئەبینی. زۆربەی زۆری ماڵی جوتیارەکانی قەراغ جادەکە ببوە بنکەی سەربازی لەو ڕۆژەدا یان چادری بچووکیان هەڵدابوو. ئەو خانو و دێهاتانەی لە سەرە ڕێگاکان ئەمبینین نیشانەی هەژاری و کەم دەرامەتی ژیانی سادەی نیشان ئەدا. منداڵی زۆرو ژنی زۆر دەستگێڕبوون و ئەهاتنە بەر پاسەکە یان ناو پاسەکە میوە یان شیرینیان دەفرۆشت. بەزەیم بەو هەموو منداڵە بچووکانە دەهاتەوە کەبەو شێوەیە پارەیان پەیدا ئەکرد، یان ئەو دایکە پیرە فرۆشیارانەی کە منداڵەکانیشیان بە ناچاری لەگەڵ خۆیان هێنابوو. هەموو جلوبەرگی هەژارو کۆن و پەڕپوتیان لەبەردابوو، پێپەتی یان کالەیەکی دڕاو لەپێیاندا بوو. دیاردەیەك دەرئەنجامی سیاسەتێکی دەیان ساڵەی ڕوتێنەرەوەی بنەماڵەو خێزانێکی سۆمۆزای سروشت تەقلیدی و هەروەها سیاسەتێکی بێبەزەیی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا دژی گەلێك کە بە

شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی هاتۆتە سەر دەسەڵات، ئەو ئەمریکا زلهێزەی کە بانگەشەی دیموکراسییەت دەکات لە جیهاندا بەڵام گەلێك برسی دەکات.

## گەیشتنمان بۆ شاری خویگالپە (Juigalpa)

پێشەکی لە ماڵێك لاماندا. دواتر چووینە ناو شار کە سەرتاپا لەژێر کۆنترۆڵدا بوو. لەلایەن سوپاوە داوامان لێکرا پاسپۆرتەکانمان نیشان بدەین. ئەوەی من سەریان لێدەر نەدەکرد بەتەواوی هی کوێیە ئەم ڕەنگ و شێوەی پاسپۆرتەی من هی پەناهەندەیی بوو لە ئەڵمانیا. بێگانەی کەش هاتبوونە ئەوێ بۆ ئەو بۆنەیە. شەو هەموو لەو ماڵە نووستین. نوێن و جێگا زۆر کەمبوو. هەندێکمان لە ناو پارکەکە نوستین و زۆریشمان لەسەر زەویە ڕەقەکە، ئاو و هەواش گەرم بوو. مێشوولەش زۆر بوو. شەو تابەیانی دەهۆڵ لێدان و هاوارو دەنگە دەنگ بوو.



یادی نۆیەمین ساڵەی شۆڕش



## یادکردنەوەی شۆڕش هەر ساڵەی لە شارێک

یادکردنەوەی شۆڕش هەر ساڵەی لە شارێك بوو. باشییەکی ئەم ئایدیایە لەوەدایە ژیانی سیاسی بخرێتە ناو ئەو شارەوە. لەو ڕۆژەدا سیاسەتمەدارەکان دەچنە ئەوێ کە بۆ خەڵکی ئەو شوێنە واتایەکی گەورەی هەیە. لەو ماوەیە سمینارو بیروراگۆڕینەوەو چالاکی سیاسی زۆر ئەنجام ئەدرێن. لە 7/19 بەیانییەکەی کەوتینە ڕێگا بەرەو ئەو گۆڕەپانەی خەڵکی بۆی ئەڕۆیشتن و وتارەکانی لێ دەخوێندرانەوە. بەپێ نزیکەی (30 خولەکێك ئەبوو. لەسەر گردێکی بەرز کە ئەیڕوانی بەسەر ناوچەکەدا (2 هەلیکۆپتەری جەنگی نیشتبۆوە. خەڵکەکە بەلێشاو بەرەو گۆڕەپانەکە ئەڕۆیشتن، دروشم و ئاڵایەکی زۆر بەدەستی منداڵ و گەورەوە ئەبینرا. ڕۆژنامەنوسان و تەلەڤزیۆن و ڕادیۆی نێوخۆو بیانی زۆر هاتبوون. کۆمەڵێك جوتیار بە سواری ئەسپەوە هاتبوون.



جوتیارەکان بە سواری ئەسپەوە بەرەو یادکردنەوەی شۆڕش

# یادکردنەوەی شۆڕش

دوای هەندێ وتاری نوێنەرانی (FSLN)، وتاری نوێنەری چەند وڵاتانێکی تر وەك کوبا خوێندرانەوە. بروسکەی ئەو پارت و وڵاتانەش ناوهێنران کە نێردرابوون بۆ یادی نۆ ساڵەی شۆڕشی نیکاراگوا. لە کۆتاییدا سەرۆکی حیزب و سەرۆکی دەوڵەت (دانییەڵ ئۆرتێگا) وتارێکی پێشکەشکرد بێخوێندنەوە لەسەر کاغەز. باری هەژاریم بە بەشداربوانی جەماوەرەکەوە دەبینی و ژمارەیەکی زۆری جوتیارو کرێکار بوون. لە گەڕانەوەمان بینیم کاروانی لۆری مەدەنی بەڕێگاوە بوون بۆ گەڕانەوەیان بۆ شوێنەکانی خۆیان. هەموو لۆرییەك بە دەیان کەس خۆی تێخزاندبوو. بەو گەرمایە بە لۆرییەکی سەردانەخراو، هیلاکی و کەم دەرامەتی دیاربوو تیایاندا بەڵام نیشانەی شۆڕشگێڕێتی و ئامادەبوون بۆ خەبات و وورە بەرزییش لە دەموچاویاندا بەدیدەکرا. ئەو شەوە تەلەڤزیۆن وتارەکەی دانییەڵ ئۆرتێگای گواستەوە لەگەڵ وێنەی بەشداربووان. ڕۆژنامەی (barricade) زمانحاڵی ((FSLN بەتیروتسەلی و بەوێنەوە هەمووی گواستەوە.





لە ڕۆژی دوای ئەوە لە ڕۆژنامە بڵاوکرایەوە کە کۆنتراکان لەو کاتەی دانییەل ئۆرتێگا وتارەکەی خوێندۆتەوە خێزانێکی جوتیاریان بەشێوەیەکی درندانە کوشتبوو لەوانە دوانیان منداڵ بوون. گفتوگۆ لەگەڵ کۆنتراکان لەوکاتەدا بچڕا بوو. کۆنتراکان دەستیان ئەوەشاند لە خەڵکی مەدەنی و لەوانەش وەك ئێمە ، کە دەهاتنە نیکاراگوا بۆ هاوکاریکردنی شۆڕش. بارودۆخەکە مەترسیدار بوو. بەتایبەتی لە شەودا پێشبینی ئەوە ئەکرا لەناو دارستانەکانی تەنیشت ڕێگاکان تەقە بکرێ لە ئۆتۆمۆبێلی مەدەنی. یان مەترسی ئەوەی لە شاری (juigalpa) لەناو شاردا لە شوێنی گردبوونەوە گشتییەکان، یان لە گۆرەپانی وتار خوێندنەوەکە بۆمبا بتەقێتەوە[2].

[2] هەموو شۆڕشێك گۆڕانە لە ژیانی گشتی کۆمەل. گۆڕانە لە بوارەکانی ئابوری ، سیاسی ، کۆمەلایەتی و ئایدۆلۆجی. چەوساندنەوەی سیاسی و ئابوری و کۆمەلایەتیش لە هۆکارەکانی دروستبوونی شۆرشە. پرسیاری سەرەکی هەموو شۆرشێك مەسەلەی دەسەلاتیشە. ئەو چینە خاوەن بریار دەبێت کە دەسەلات دەگرێتە دەست. هەموو شۆرشێکی کۆمەلایەتی هەمان کات شۆرشی سیاسیشە. ئامانجی ئەو شەڕە سیاسیە پێکهێنانی دەسەلات و بەهێزکردنیەتی وەك ئامرازی دروستکردنی کۆمەلگایەکی نوێ. ناکۆکی و ململانێ ناوخۆییەکانی کۆمەلگا هۆکاری سەرەکی شۆڕشن (جوتیارو دەرەبەگ / کرێکارو چینی سەرمایەدار ...). هۆکارە دەرەکیەکانیش کاریگەرییان هەیە لەسەر ئەوانەی ناوخۆ کە گەشەکردنی شۆرشێك خێرا یان هێواش بکات. لە هۆکارە دەرەکی و ناوخۆییەکان بۆ نیکاراگوا وەك : شەڕی کۆنتراکان ، مەترسی داگیرکردنی سەربازیی لە لایەن ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاوە، ئابلوقەی ئابوری ، قەیرانی ئابوری نێوخۆ ، پاشماوەکانی جەنگ...



نووسەر / یادی نۆ ساڵەی شۆڕشی ساندینیستی

## دوبارە گەڕانەوە بۆ گوندەکەمان

لە 7/21 و 7/22 کە ڕۆژی پێنج شەممەو هەینی دەکرد دەستمان کرد بەکارکردن بۆ دروستکردنی شەقامێکی گوندەکە. ڕۆژانە 4 کاتژمێرێك کارمان دەکرد. وەستایەك و 3 کرێکاری نیکاراگوایی کاریان لەگەڵ ئەکردین. کۆمەڵە کەرەسەیەکمان لەگەڵ خۆماندا بردبوو لە ئەڵمانیاوە. نۆ عەرەبانەی خۆڵ گوێزانەوەمان کرِی کە تایەکانی لە ئاسنی پان دروستکرابوو ، قورس بوو بۆ پاڵ پێوەنان. ئیشەکەمان بریتیبوو لە دروستکردنی شەقامێك بۆ یەکێك لە کۆڵانەکانی دێکە بە خشتی سوور. پێشەکی خەریکی شۆستە دروستکردنەکە بووین. لە دواییدا بە خشتی پان



جادەکە دروست دەکرا. لە راستیدا کارەکەمان زۆرتر شتێکی رەمزی بوو. لە کاتی باریندا کۆڵانەکان ئەبوونە قوڕو چڵپاو. کچ و کوڕانی دێکە خۆشیان ئیشیان ئەکرد لەگەڵماندا. هەندێ لە کۆڵانەکان خشت ڕێژ کرابوون بەتایبەتی لەبەشی باشووری دێکە. دوای نیوەڕوانیش لە دوای ئیشەکە سەرقالبوین بە سمینارو قسەکردنمان لەگەڵ کاربەدەستان، یان سەرقاڵی بەشداربوون بووین لە بۆنەکانیاندا، یان ڕۆژنامە خوێندنەوەو سەعی زمانی ئیسپانی و جل شتن و سەفەرکردن و کڕینی پێداویستییەکانمان. زۆرجاریش بارانێکی زۆر ئەباری و دەبوایە لە ماڵەوە بمێنینەوە، بەڵام شتێکی ئاوها زۆریش نەبوو بیکەین و ژیانەکە زۆر سادە بوو.



بریگادیستەکان / ڕۆژانی کارکردنمان

# 7/23 ماتەمینی بۆ چوار شەهیدەکە

لە شەڕی کۆنتراکان چوار لە پیشمەرگەکانی گوندەکە شەهید بووون و هێنرانەوە بۆ بە خاك سپاردنیان، بەڵام بەشێوەی خۆپیشاندان بەڕێوەبرا. کۆمەڵێك قوتابی لاو لە کچ و کوڕ ئالای (FSLN) یان لەمل کردبوو، بەجلی قوتابخانەوە لە پێشەوەی ڕیزەکە بوون، دواتر (16) سەرباز کە لە شاخ گەڕابوونەوە بەجلی پێشمەرگەوە بە دروشمی قوماشی گەورە ڕیزی دووەمیان دروستکردبوو. لە دوای ئەمانەوە دایکانی (4) شەهیدەکە. دوای ئەمان ئێمە بووین. ئێمە بریگادیستەکان بە دروشمێکی گەورە بە زمانی ئیسپانی و ئەڵمانی. لە دوای ئێمەشەوە کۆمەڵی دەهۆڵ لێدان و خوێندکاری گەورەو بچووك، کە جۆرە چالاکی خۆماڵییان دەنواند. 7–8 گروپ لە منداڵ و گەورە چالاکی نیشتیمانیان پێشکەشکرد بە مۆسیقاو دەهۆڵ لێدانەوە. ئەم ڕێپێوانە دوورودرێژە کە زۆربەی خەڵکی ئاوایی لێکۆبووبۆوە کەوتینە ڕێگا بەرەو شوێنی کۆبوونەوە. بە بەشداری بەشەکانی میدیا لەوێ ئەندامێکی گروپە گەڕاوەکەو ئەندامێکی ڕێکخراوی لاوانیش وتاریان خوێندەوە. لێپرسراوی بارەگا (خوان ڕامیرۆ) لەدێ نەبوو. دوێنێ لە شار بینیم بۆ کاروباری سیاسی سەفەری ئەکرد بۆ شاری (گرێنادا). جێگرەکەی (کارلۆ) سەرپەرشتی کاروبارەکانی ئەکرد. نوێنەری ئێمەش وتاری خۆی خوێندەوە. زۆرینەی دانیشتوانی دێکە ئامادەی ئەو بۆنەیە بوو. بە سرودی نیشتیمانی کۆتایی پێهێنرا. دواتر کەوتینە ڕێگا بەرەو گۆڕستان و لەوێ دروشم کێشرا بەڕۆحی ئەو (4) شەهیدە.






**لە پێشوازی هاتنەوەی چوار شەهیدەکە**

لەوێ چووینە سەر گۆڕی شەهیدەکانی تر کە ژمارەیان بەگشتی (21) بوو. دوایی گەڕاینەوە بۆ یەکێك لەماڵی شەهیدەکان. لەوێ شەربەت و سەموونیان گێڕا. لە ماڵی شەهیدەکان بە نەریتی مەسیحیانەی خۆیان دوعا بۆ گیانی شەهیدەکان ئەکرا. لەم دێیەش کە هەرجارەی کۆمەڵێك گەنج ئەبوونە سەرباز، یەکێکیان کە بە زۆرە ملێیە پێی ئەوترێ SMP: Servicio militar Patriotico. ئەوەی تر ئارەزوومەندانەیە پێی دەوترا SMP: Servicio Militar de Reserva.. لە ڕۆژی یەك شەممە 7/24 بە بۆنەی گەرانەوەی پێشمەرگەکان لە دێکە ئاهەنگێکی گەورە ساز کرا کە ئەمان پێی دەڵێن (فیێستا).



**گۆڕستانی شەهیدان**

# پەیوەندیەکانم لەگەڵ شۆڕشگێڕەکان

پاش ماوەیەك مانەوەم لە گوندەکە پەیوەندیم لەگەڵ شۆڕشگێڕەکاندا دروستبوو. جاروبار جل و بەرگی پێشمەرگایەتیم لەبەردەکردو لەگەڵیان دەڕۆیشتم بۆ شاخ و لادێکان. هەندێکجار دەڕۆیشتین بۆ تەقەکردن. زۆرێك لە بەشەکانی میدیا دەهاتن و دیداریان لەگەڵ ئەنجام ئەدام. مەبەستم بوو کە دەنگی گەلەکەشم بگەیەنمە میدیاکان و دەسەڵات. بەم بۆنەیەوە لە رۆژنامەکان باسیان لێوە کردم و بایەخیان پێدام.





**نووسەر بە جل و بەرگی شۆڕشگێرەکانەوە**



**نووسەر**

## ڕۆژی هەینی 7/22 گوێزامەوە بۆ لای خێزانێکی تر

داوام لە ڕێکخەری کاروبارەکان کرد بگوێزمەوە بۆلای خێزانێکی تری جوتیار. ئەو خێزانەی بۆ یەکەمجار چوومە لایان پڕ گێروگرفت بوو. خێزانێکی ڕووخۆش بوو، خێزانێکی گەورە بوو، بە سوود بوو بۆ لێکۆڵینەوەو زۆر شت فێربووم لێیانەوە. خۆیان هیلاك ئەکرد بۆئەوەی مانەوەکەم باش بێت لە لایان، بەڵام هیچ سەربەستییەکم نەبوو تەنانەت جل گۆڕینم گرانبوو.



**نووسەر لای خێزانی یەکەم**



لە کاتی کورتدا ژن و پیاو و منداڵ خۆیان ئەکرد بە ژووراو سەرقاڵیان دەکردم، بەتایبەتی کە ئەو مارە ژەهراویەشم بینی لە ژوورەکەمدا، کە نزیکبووم لەوەی مەرگمی پێبسپێرم ئیتر مەترسیم زیاتر بۆ پەیدابوو و چیتر بگوێزمەوە. هەر شەوە ناشەوێك ئاهەنگێکی دینی ئەگێڕدرا لەوێ مێشکی سەریان بردبووم. چ من و چ خێزانەکە پێمان ناخۆش بوو یەکتری جێهێڵین و بگوێزمەوە بەڵام کات وەرگرتن بۆ خوێندنەوەو نووسینی یادەوەری و ڕووداوەکانی ڕۆژانەم پێویست بوو.



**ئەو مارە ژەهراوییەی لە مەرگ نزیکی کردمەوە**

لەبەرئەوەی کەنیسە ڕۆڵی کەم بۆتەوە لە نیکاراگوا جاروبار خربوونەوەی دینی لە ماڵەکان ئەنجام ئەدرا. بە پێچەوانەی ماڵی دووەم لە ماڵی یەکەمم (خاتوو ماریا لۆلە) مێسەی دینی تیا ساز ئەکرا. قەشەیەك قسەی بۆ خەڵکەکە ئەکردو ئەیکردە هەراوهوریا بەسەر خەڵکی هەژاردا. کابرای قەشە زمانی ئینگلیزی ئەزانی. لە یەکەم شەو نزیکەی نیو کاتژمێرێك قسەم لەگەڵ کرد. ئەیویست بەشێوەیەك بڕوام بە خواو دین پێ بکات بەو قسانەی کە لە منداڵیدا لە پۆلی یەك و دووی سەرەتایی بۆیان باس دەکردین یان مرۆڤی ساویلکە، کە بەشێوەی بازاڕیانە بیەوێ بڕوات بەشتێك پێبکات. لێم پرسی تۆ هەموو شەوەکە باسی خواو عیسایان بۆ ئەکەیت و ئەیانترسێنیت و باسەکانت زۆر خەیاڵی و نابابەتیانەیە. ئەم جوتیارانە ئەوەی کە پێویستیانە ڕیفۆرمی کشتوکاڵییە، فێرکردنی چۆنێتی تەکنەلۆژیاو شتی گرنگی ژیانە، دۆست و دوژمنیان پێنیشان بدرێت. پێموت سەرکردەکانی کەنیسە لەبەرەی ڕژێمی سۆمۆزا کاری کرد و ئێستاش بەشێکی پشتگیری دیکتاتۆرو کۆنتراکان ئەکات. دەرەقەت نەهات و زمانی لاڵ بوو، ئەیوت ئێمە دەست ناخەینە ناو کاروباری سیاسییەوە. وتم باشە ئەوەی تۆ ئەیکەیت ئایا ئامانجی سیاسی تیدا نییە؟





بنەماڵەی خێزانی یەکەم / مەریا لۆلا



گوندی ئەل ڕۆزاریۆ

لە ژنی خاوەن ماڵەکەم پرسی بۆ ڕێگا بەمانە ئەدەیت ئەم شتە لێرە بکەن. پرسیارەکەم لە دوای ئەوەی کە خۆی وتی ئەم قەشەیە زۆر کۆنەپەرستەو دژی (FSLN)ە. لەوەڵامدا وتی لەبەرئەوەی تکایان لێکردم چونکە هۆڵەکەی ئێمە گەورەیەو جێگای خەڵکەکەی تێدا ئەبێتەوە. دیارە بۆ خاتوو مارییا سەربەرزیەو ددان پێدانانە تکای لێبکرێ و لە ماڵەکەی ئەودا ئەم چالاکییە دینییە بکرێت. خەڵکەکە هەر یەکەو کورسییەکی سادەی تەختەی لەگەڵ خۆی هێنابوو. بەڵام منداڵەکان خۆشییان لە سلاید نیشاندانەکان ئەبینی. لە کۆتاییدا گوێزامەوە بۆ لای خێزانیکی تر بە ناوەکانی رامۆن نیکاراگوا و خاتوو ماریاو دوو کچی بچکۆلەشیان هەبوو.



توالێتی ماڵی یەکەم





هەمان تەوالێت

## گفتۆگۆ لەگەڵ ڕێکخراوەکان

لە دوای پێشنیازو بیروراگۆرینەوە بڕیارماندا لەماوەی مانەوەمان لەم گوندە لێدوان ئەنجام بدەین لەگەڵ کۆمەڵێ لە ڕێکخراوە سیاسی و جەماوەریەکان و هەروەها سەردانیی هەندێ لە مەلبەندە گرنگەکانی ماناگوای پایتەختیش. ڕێکخراوەکان بەگشتی ئەمانەی خوارەوە بوون:

لێدوان لەگەڵ (ATC) کۆمەڵەی کشتوکاڵی.

ئۆپۆزسیۆنی (psc).

(AMNLAE) ـ ڕێکخراوی ژنان لە شاری (Jinotepe).

سەردانی بەندیخانەیەك لە ماناگوای پایتەخت.

رۆژنامەی (Barricada) لە ماناگوا. زمانحاڵی بەرەی ساندینیستی.

(La Preusa) لە ماناگوا، رۆژنامەی کۆنزەرڤاتیڤەکان و دژی بەرەی ساندینیستی.

لێدوان لەگەڵ سەندیکای کرێکاران (CST)، سەردانی کارگەیەکی پێڵاو.

زانکۆی ماناگوا، وتووێژ لەگەڵ ئۆرگانی خوێندکاران.

سەنتەری منداڵانی بێ دایك و باوك و بەجێهێڵراوان لە ماناگوا.

لێدوان لەگەڵ رێکخراوی جەماوەری (CDS) لە گوندی El. Rosario و هەروەها لە شاری Jinotepe.

وەزارەتی رۆشنبیری.

پەیمانگای تەکنیکی هەمەجۆر.

لیژنەی مافی مرۆڤ / ماناگوا.

رێکخراوی کەمئەندامان.

نەخۆشخانەی نەخۆشی دەروونی.

چاوپێکەوتن و لێدوان لەگەڵ (Fernando) وەزیری پەروەردە.

دیدار لەگەڵ جێگری پارێزگای شاری (Jinotepe).



## گفتوگۆ لەگەڵ رێکخراوی جەماوەریی (CDS)

رۆژی سێ شەممە بەرواری 7/26 گفتوگۆیەکمان لەگەڵ رێکخراوی جەماوەریی (CDS) لە دێی (El- Rosario) ئەنجامدا. لە کاتی سەرکەوتنی شۆڕشەوە (CDS) لەم دێیە دروستبووەو لە (7) سەکتۆر پێك هاتووە. بۆ باشتر بەڕێوەبردنی کاروباری ئەندامەکانیان چالاکن و بەردەوام دێنە کۆبوونەوەکان. چالاکی جۆراوجۆر رێك دەخەن وەك ئاهەنگ و لەدایك بوونی منداڵان، ئاهەنگی شیرینی دابەشکردن کە پێی ئەڵێن (پینساتا). بەشداریکردن لەم رێکخراوە جەماوەرییە بۆ هەموو کەسێکە مەرج نییە ئەندامی (FSLN) بێت. لە کەژی باران باریندا دوو جۆر مێشوولە هەن، کە دوو جۆر نەخۆشی دەگوازنەوە. ئەم رێکخراوە چالاك بوو لە نەهێشتنی. ئەمانە ئەگەڕێن ماڵ بە ماڵ بۆیان باس ئەکەن چی بکەن لە دژی ئەم جۆرە نەخۆشیانەو پرسیاری گیروگرفتەکانیان ئەکەن. پێکهاتەی رێکخراوەکەو ژمارەی ئەندامەکانیان بەندە بە پێکهاتەی ئەو لادێیەوە یان شارۆچکەیەوە. (CDS) جەماوەری دێکە مۆبیلیزە ئەکات، پاڵیان پێوە ئەنێ و پشتگیریان ئەکات لە کاروبارو چالاکیدا. بۆ نموونە ئەو پارکەی لە ناو دێکە دروستکرابوو بۆ دانیشتن و وەرزش و کات بردنەسەر بەرێگای بەشداری دانیشتوانی دێکەوە خۆی بوو. خەڵکی دێکە ئەبینن ئەم پرۆژەیە بۆ خۆیانە بەشداری تێدا دەکەن بۆ کارکردن و دروستکردنی بەڵام ئەم رێکخراوە

جەماوەرییە (CDS) ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت تێیاندا. ئەندامانی کۆمێتەکەیان دیموکراسیانە هەڵئەبژێردران. هەر چواردە ڕۆژ جارێك بەشەکان دانیشتنیان دەکرد. لە چالاکییەکانی تریان وەك: ئەگەر یەکێك بمرێت لە خێزانێك یان خێزانێك هەژار بێت، یان ئەگەر یەکێك لێیان بچێت بۆ بەرەی شەر ئەندامەکانی (CDS) پارە بۆ ئەمانە کۆئەکەنەوەو یارمەتیان ئەدەن. ماڵ بەماڵ ئەگەڕێن و هەوڵی پیتاك کۆکردنەوە ئەدەن. یان یارمەتی کۆکردنەوە بۆ خێزانی ئەو پێشمەرگانەی کە ئەچوون بۆ بەرەی شەر.

حکومەتی ناوچە رۆڵی نێوانگیر دەبینێت. بەرێگای بارەگای دێکە هاوکاری خەڵکی دێکەی ئەکرد. ئەو کاتەی ئێمە لەوێ بووین لەگەڵیان شەقامەکانی خشت ڕێژ ئەکرد. کەرەسەیان بۆ ئەناردن و خەڵکی ئاواییەکەش خۆیان ئامادەیی کارکردن و ئاوەدانکردنەوەی شوێنەکانی خۆیان هەبوو. وەك دەبینرێ ئەم کارە لە سەرەوە نایەت بۆ خوارەوە بەڵکو بەپێچەوانەوە لە خوارەوە بۆ سەرەوە. کاروبارو رۆڵی ئەمانە ئەوە نەبوو خەریکی بڵاوکردنەوەی ئایدۆلۆژیای حیزب بن بەڵکو خەریکی بەڕێگاوە بردنی کاروباری گەل بوون. زۆربەیان لە پارتی ساندینیست بوون بەڵام زۆریشیان تیابوو ساندینیست نەبوون. بەڵام ئەوانەی کە ساندینیست نەبوون دیاربوون. ئەوانەی کار لە (CDS) ەکان ئەکەن بەو مەبەستە کار ئەکەن کارەکەیان گرنگ و ڕاستن بۆ شۆڕش. پارتەکانی تر کە لەوێ هەبوون لاواز بوون و هێزیان نەبوو. چالاکی و هێزی (CDS)ەکان جیاوازبوون لە دێیەکەوە بۆ دێیەکی تر. بۆ نموونە دێی (Santa Teresa) کە چوار کیلۆمەتر دوور بوو لە ئێمەوە ئەوەندە چالاك نەبوون وەك ئەم دێیەی ئێمە



(EL Rosario) کە ڕێژەی شۆڕشگێڕییان زۆرتربوو، بەڵام لە هەموو دێیەك (CDS)ی لێیە، کە کۆن ناوێکی تریان هەبوو. لە کاتی شۆڕشدا لە پرۆسەی پارتیزانیدا دروستبوون. پرسیارمان دەربارەی بەشداری ژن کرد، لە وەڵامدا: ژن زیاتر بەشدارن وەك لە پیاو. بۆ بڕوابوون وتیان ئەتوانن بێنە کۆبونەوەکان و ببینین. پارە زۆر کەمبوو. توانای خەرجییان کزبوو. وڵات بەگشتی لە ڕووی داراییەوە هەژار بوو. لەم دێیە نیوەی قوتابخانەکانی بەبێ پەنجەرەو دەرگا بوون. ماوەیەکی زۆر بوو ئەیانویست خەستەخانەیەك دروستبکەن لەم گوندە بەڵام بۆ ئەوەش پارە نەبوو.

## دەربارەی خێزانی دووەم من لایان ژیام

خێزانێکی بچووك بوو. ژن و پیاوێك و دوو مندالی بچووك. هەردووکیان کچ بوون. پیاوەکە بە ناوی (ڕامۆن نیکاراگوا). ژنەکەی ماریا. کچەکانیان یەکێکیان (بێستانیا) تەمەن (2) ساڵ. کارۆلینا (4) ساڵ. ڕامۆن لە کاتی خۆیدا پێشمەرگەی شاخ بووە. هەموو کەسوکارەکەی جوتیار بوون. لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشەوە چیتر بۆ دەرەبەگ کاری نەدەکرد. (کۆئۆپەرەتیڤێکیان) هەرەوەزییەکیان دروستکردبو. ناوچەیەکی کشتوکاڵی هاوبەش کە (40) خێزان بەیەکەوە کاریان تێدا دەکرد. دایك و باوکیشی هەرلەوێ کاریان ئەکرد. ڕامۆن لە هەمانکاتدا پێشمەرگە بوو. جاروبار جلوبەرگی فەرمی لەبەر ئەکردو لە میرییەوە کلاشینکۆفێکی درابوویە، کە

دوو ڕۆلی ئەبینی. یەکێکیان بۆ پاراستنی کێڵگەکەیان دژی کۆنترا. ڕۆڵی دووەم لە پاڵ پێشمەرگەکانی هاوەلی بۆ پاسەوانی و پاراستنی دێکە.



رامۆن حەزی بەشەڕە کەڵەشێرەکانی بوو / خێزانی دووەم

ژیانی ئەمانیش زۆر سادە بوو. بەیانی و نیوەڕۆ برنج و فاسۆلیای سوورمان ئەخوارد. ئێوارەش فاسۆلیاو برنج. جاروباریش بێ برنج. جارجاریش هێلکەیەکیان ئەکردە ڕۆنەوە بۆ ئێمە یان سەمونێك.





مەتبەخی خێزانی دووەم

ماریای ژنەکەی ڕامۆن بۆی باس کردم کە لە نێوان کەژی باران نەبارین و دەستپێکردنی باران بارینداا خواردنیان نەمابوو بیخۆن. هەژاری و برسێتی باڵی کێشابوو بەسەریانداو دەستی یارمەتیان بۆیەکتر درێژ دەکرد. ئێستاش گیروگرفتی نوێ ئەوەبوو کە ئەو ساڵە باران زۆر ئەباری. ئەوەش زیانی گەورەی ئەگەیاند بە کشتوکاڵەکانیان بەتایبەت رووەکی فاسۆلیا، کە خواردنی سەرەکیانە. بەواتا باران نەبارین گیروگرفت لەگەڵ خۆی دێنێ، باران زۆر بارین و لافاو دروستکردنیش زیانی بەدواوە بوو. فاسۆلیا ڕووەکێکە زۆر نزم ئەڕوێ و زوو تووشی زیان ئەبێ و نووقمی ئاو دەبوو. لە ئەڵمانیاوە هەندێك چای رەشم لەگەڵ خۆم بردبوو، لە مەتبەخەکە بە دار ئاگرم کردەوەو لێمنا بەڵام وەك دەرمان ئەیانخواردەوەو دەیانوت ئەم شتە ناخۆشە چییە هێناوتە؟




**نووسەر لە مالی ڕامۆن / وەك سومبلێك بۆ خەباتی چەكدارییان**

## ژیانێکی بەئازار

ژیانی ڕامۆن پڕ هیلاکی و ئیشی قورس بوو. بەیانیان لە کاتژمێر پێنج هەموو ئەڵئەستن لە خەو. ڕامۆن تاکو نیوەڕۆ لە کێلگە هەرەوەزییەکە کاری ئەکرد. پاش نیوەڕۆ یارمەتی باوکی ژنەکەی ئەدا لە کێلگەکەدا ، کە لەبەر ناچاری بۆ بژێوی ژیان بۆ دەرەبەگێکی بچووکیش هەندێ کاری ئەکرد ڕۆژی بە (100) کۆردوبا کە سابونێکی جلشتن بە (250) کۆردوبا بوو. ژنەکەی سەرانسەری ڕۆژەکە خەریکی جل شتن و چێشت لێنان، ئاو کێشکردن و دارهێنان بوو. بە دار ئاگر ئەکەنەوە بۆ چێشت لێنان ، ژوورەکەی من پڕ ئەبوو لە دووکەڵ. چاوم ئەکزایەوەو تەنگە نەفەس ئەبووم بەڵام چاریشم نەبوو. ڕامۆن جاروبار یارمەتی ژنەکەی ئەدا ئەگەر نەخۆش بوایە یان ڕامۆن کاتی زۆرتر بوایە. منداڵەکەیان (کارۆلینا) دانی ئیلتهابی کردبوو، ئاوسابوو. لەبەر بێ پارەیی نەیان ئەزانی بڕیاری چی بدەن بۆی. من پارەم دانێ.



ژیانیان بریتییە لە کارکردن هەمیشە لە بەیانییەوە بۆ شەو هەر حەوت ڕۆژەکە لە هەفتەیەکدا لە پێناوی ژیاندا. بەڵێ خەباتێکی قورس لە پێناوی ژیاندا وەك سەدان ملیۆن مرۆڤی تری هەژاری ئەم جیهانە. خانوویەکی زۆر سادەیان هەبوو. هەموو شتەکانیان لە تەختە دروستکردبوو. بۆ خانوو دروستکردن یارمەتی یەکتر ئەدەن. درەختی گەورە ئەبڕنەوە بۆی و بەیەکەوە کاری تێدا ئەکەن. ئەم خێزانە نە ڕادیۆ، ریکۆردەر، تەلەڤزیۆن... هیچیان نەبوو. بۆ خۆشتن ئەبوایە مرۆڤ سەتڵێ ئاو لەگەڵ خۆی بەرێتە کونجێکی بچووکەوە، کە بە تەختە دروستیان کردووەو بە گوێنی دەوریان گرتووە. ئاوەکەش هەمووی ئەڕۆیشتە ناو باخەکەوە.



**گەرماوی خێزانەکە**

دوو مریشك و کەڵەشێرێك و بەرازێکی بچووکیان هەبوو. مریشکێکیان گەورەتربوو جاروبار خۆی ئەخزانە سوچێکەوە هێلکەیەکی ئەکرد. ڕۆژێکیان سێ هێلکەم خستە ژێر مریشکەکەوە گوایە ئەم کردویەتی. خاتوو مارییا ئەم هێلکانەی بەلاوە سەیربوو. ئەو برنجەی کە ئێمە بە ئاسانی ئەمانخوارد بەزەحمەت ئەوان ئەیچێنن بەپوشەکەوە ئەیهێننە ماڵەوە. بەشێوەی سەرەتایی لە ناو دارێکدا کە کونیان کردووە بۆ ئەو مەبەستە بە کوتەکێکی دار لێی ئەدەن و پوشەکەی ئەکەن بەبادا. جاروبار دایکی مارییا بەو پیریەوە برنجی ئەکوتا کە کارێکی گرانە. قاوەش بەهەمان شێوە.



**برنج کوتین بە شێوەیەکی سەرەتایی**



لە باخەکەیان کۆمەڵێ داریان ڕواندبوو وەك مۆز، گەنمەشامی، فاسۆلیا، پیاز ... بۆ پێویستی خۆیان. شتی یارییکردن بۆ منداڵەکان نەبوو. یاریی بە مریشك و کەڵەشێر و سەگ و بەراز ئەکەن. بێتاقەتی و نەبوونی ئامرازی سەرقاڵبوون خۆی نیشان ئەدا لە ژیانی ڕۆژانەی ئەم منداڵانەدا.



**رامۆن نیکاراگوا**

## تراژیدیای ماڵە هاوسێکەمان

لە 4. 8. 1988 چوومە ماڵی دراوسێیەکمان. لەگەڵ چوونە ژوورەوەم حەپەسام و وڕ بووم کە چاوم بە دیمەنی ئەو ژیانە کەوت. ماڵەکەیان لە تەختەو دار دروستکردبوو هەروەك ژیانی سەرەتایی. پشت ژوورەکە تاریکبوو، جێگایەکی نووستنی تیابوو لە ناو پووش و پەڵاشدا، کە منداڵ لە سەری ئەنووستن بەتەواوی لە تەختەشۆری مردوو ئەچوو. لە ناو ئەم

کوخەدا مەنجەڵێکی گەورە لەسەر ئاگر بوو بێگومان فاسۆلیای سووری تیابوو. منداڵەکان بەقاپی تەختەوە دەورەیان دابوو. دیمەنێکی زۆر سەرسووڕهێنەر بوو. ژیانێك وەك ئاژەڵ. ئەوەی هەیانبوو کەم بوو بۆ ژیان بەڵام زۆربوو بۆ مردن.



**شوێنی نوستنی مرۆڤ لە ماڵێکی هاوسێکەمان**

خێزانەکە بریتی بوو لە نۆ کەس. ژن و پیاوێك و حەوت منداڵ. ژنەکە تەمەنی چل و پێنج ساڵ بوو بەڵام زۆر پیرتر دیار بوو وەك لە تەمەنی خۆی. لەبەر بێ ڤیتامینی و کەم خواردنی پێویست تەنانەت مەمکی پووکابۆوە. بەشێکی منداڵەکان نەدەچوونە قوتابخانە. باوك و کوڕێکی لە کێڵگەیەك کاریان دەکردو ئەوەش تەنها سەرچاوەی ژیانیان بوو. باخەکەشیان زۆر بچکۆلە بوو بۆ ڕواندنی میوەو سەوزەوات. بەرازێکیان هەبوو کە ئەتوانم بڵێم خۆی خۆی ئەژیاند. بەیانی تاکو ئێوارە بەم ناو باخ و



باخی ماڵی دراوسێیانە ئەسووڕایەوەو ئەگەرا بەشوێن خواردندا، هەموو خەباتی بۆ ژیانی ورگی بوو.



**فاسۆلیای سوور لە ناو مەنجەلی مەتبەخی مالی هاوسێکەمان**

بینیم کە سەگ و بەراز هاوڕێی نزیکی مرۆڤ بوون. تەنانەت ئاژەڵەکانیشیان لاواز بوون. بە دەگمەن گیانلەبەرێکم ئەبینی کە ئێسقانی پەراسوەکانی بەدەرەوە نەبێت. بگەڕێمەوە سەر باسی خێزانی هاوسێکەمان. کونجێکیان دروستکردبوو بە پووش و پەڵاش. کاتی خۆی بڕوا ئەکەم، کە بۆ کۆیلەش هەر ئەوە دروستکرابێت. ئەو بارودۆخە وای لێکردم هەمیشە خۆم بەراورد نەکەم بە دەولەمەندو ئەوانەی سەرو خۆم، بەڵکو بە هەژارەکانی خوار خۆشم، قەناعەت بەوە بهێنم کیفایەتم ئەدات بەڵام بە توندی دژی ئەوانە بوەستمەوە کە دەبنە هۆکاری هەژاربوونی مرۆڤەکانی تر بە ڕێگای رووتاندنەوەیان. هەژاری و دەوڵەمەندی مرۆڤەکان شتێکی ڕێکەوت نییەو بێهۆ نییە.



**ژنی ماڵە هەژارەکەی هاوسێمان**

شتێکی تر کە سەرنجی راکێشام ئەوە بوو ئەم ژن و مێردە ماوەی (25 ساڵ بوو لەم کوخە ئەژیان. ژنەکە تاکو ئێستا تەنها ماناگوای پایتەختی یەک جار بینیبوو کە تەنها پەنجا کم دوربوو لە ئێمەوە. نە ڕادیۆ، نە تەلەفزیۆن، نە ریکۆردەر هیچیان نەبوو. لە ناوەڕاستی ژوورەکە لەسەر تەختەیەکی پان وێنەیەکی عیسا و حەزرەتی مریەمیان هەڵواسیبوو، دەوروپشتەکەیان ڕازاندبوەوە بەگوڵی لاستیك و وەرەقی ڕەنگدار. دیاربوو نوێژو باوەڕی ئایین پشوویەکی دەروونی و هیوای پێ ئەبەخشین. نە ئاو، نە کارەبایان نەبوو. شەو لەبەر قوتیلەی نەوت یان ئاگر دائەنیشتن. نووستن ئیتر لە شەو دوای هەشتەوە دەستی پێدەکرد. بەیانیان زوو هەڵدەستان لەخەو. یەك هەنگاوی تری هەژاربوون بەواتا کەوتنە سەر جادە. لە



جیهانێکی چەندە نایەکسان و نادادپەروەر دەژین. نیکاراگوا هەژارترین وڵاتی ئەمریکای ناوەڕاستە. پێشتر روتاندەوەی خێزان و بنەماڵەی سۆمۆزا بەرامبەر بەو گەلە، هەروەها بایکۆتی ئابووری ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکاو شەڕی کۆنتراکان لە دژیان و بە هۆیەوە خەرجی حکومەتی نیکاراگوا بۆ بواری سەربازیی هۆکارێکی گەورە بوو بۆ تێکدانی باری ئابووری و ژیان و گوزەرانی گەل. نیکاراگوا وڵاتێکی هەژاری جوتیاری بێ نەوتەو رژێم و بنەماڵەی سۆمۆزا کەلاوەیەکی بۆ نەوەی شۆڕش جێهێشت.




**منداڵێکی هاوسێکەمان بە جل وبەرگ و ئاڵای بەرەی ساندینیستەکان**

## هەژاری و برسێتی

هەژاری و برسیەتی زۆر بوو. لە سەر جادەکان بە دەیان منداڵی بچووك و ژن و پیاوی پیرو کچی گەنج بونەتە دەستگێڕ. بەسینییەکەوە کە شەکلەمەو لوقمی لەسەربوو یان منداڵی بچووك بەچەند ڕۆژنامەیەکەوە بەیانی تا ئێوارە هاوارو بانگ و ڕاکەڕاکیان بوو بۆ فرۆشتنی، زۆر دایك لە شوێنی وەستانی پاسدا شەربەتیان ئەفرۆشت (فریسکۆس). منداڵە بچووکەکانیشیان بەناچاری لەگەڵ خۆیان هێنابوو. منداڵی بێ دایك و باوك زۆربوو. چ بەهۆی بارودۆخی جەنگەوە کە باوك یان دایکیان شەهید بوون، یان بەهۆی هەژارییەوە بۆیان بەخێو ناکرێن. هۆیەك بۆ تێکچوونی سەقامگیری کۆمەڵایەتی. هەر چیەکیان ئەدەیتێ وەری ئەگرن لە خواردن، پارە، بەتایبەتی خواردن. نرخ بەرزترببۆوەو هێزی کڕینی شتومەك دابەزیبوو. جاروبار شەرمم ئەکرد مۆزێك یان شتێکی تری خواردن بدەم بە کەسێك چونکە ڕووخساری ئەوەندە کەسایەتی پێوە دیاربوو بەڵام وەریشی دەگرت. خۆیان هەرگیز داوای خواردن یان پارە لە مرۆڤ ناکەن، بەوەشەوە شانازی و کەسایەتی خۆیان دەپاراست. لە کڕین و پارەداندا ساختەیان نەدەکرد.





کوڕێکی گەنجی ڕۆژنامە فرۆش هاتە دوکانێکی پیزا کە نانمان لێدەخوارد. لە سوچێکدا دانیشت و لە ژنە ئیشکەرەکەی پرسی ئەگەر بۆی هەبێت پاشماوەی پیزاکان کۆ بکاتەوە. کوڕە گەنجە ڕۆژنامەفرۆشەکە سەیرێکی خەڵکی ناو ریستۆرانەکەی کرد بینی کەس سەیر ناکات پاشماوەی پیزاکانی لە ژێرەوە خستە سەر نایلۆنی ڕۆژنامەکانی و بردییە دەرەوە خواردی. وێنەیەك هەرگیز لەبەرچاوم لاناچێت. بینیم کە هەژاریی دەدرێکی چەندە گرانە.



له ماناگوای پایتەخت بازاڕی شەعبی خواردن فرۆشتنی زۆر لێیە. یەکێك لەوانە ناوی (marcado Oriental). بە هەزاران کەس بە سەبەتەو لەسەر جادە خواردەمەنی ئەفرۆشن. بەیانی تاکو ئێوارە هەمان بەزمە. زۆریان شەویش هەر لەوێ ئەنون. زۆرجار لەخۆمم ئەپرسی چۆنە ئەگەر مرۆڤ هەموو ژیانی هەرئاوا بێت، تەنها بۆ پەیداکردنی نانی ئەمڕۆ بۆ سبەینێ بژی، تەنها لە دەستەوە بۆ دەم بژی. کاتێکی زۆر بە ئازارم بردەسەر لەو وڵاتە، بەڵام زۆر بەسوود بوون بۆ ژیان. فەلسەفەی ژیانم بووە فەلسەفەی خەبات و تێکۆشان لە پێناوی دادپەروەری و عەدالەتی کۆمەڵایەتی دژ بە هەژاری و چەوسێنەر و رووتێنەر. هەندێکجار خوێندنەوەی دەیان کتێبی تیۆری ناگات بە ئەزموونێکی عەمەلی.





مارکادۆ ئۆریەنتال / بازاری شەعبی لە ماناگوا



## بارەگای ڕێکخراوی ژنان (AMNLAAE)

ڕۆژی پێنج شەممە لە 7/28 لێدوانێکی ترمان لەگەڵ (CDS) ئەنجامدا بەڵام ئەمجارە لە شارۆچکەی (Jinotepe) بوو کە سەنتەری ئەم ڕێکخراوە مەدەنی و جەماوەریەی لێبوو. بەرپرسی ئەم ڕێکخراوە جەماوەرییە باسێکی گشتی (CDS)ی بۆ کردین. لێدوانەکەمان لە بارەگای ڕێکخراوی ژنان بوو. (AMNLAAE) . هەروەك پێشتر ئاماژەم پێداوە (CDS) دوو ساڵ پێش سەرکەوتنی شۆڕش دروستبوو بۆ پشتگیریکردن لە شۆڕش. لە چالاکییەکانی کاتی شۆڕش وەك باریکادە دروستکردن. لە نیکاراگوا زۆربەی زۆری شەقامەکان بەخشتی چیمەنتۆ داڕێژراون. لە کاتی شۆڕشدا شۆڕشگێڕەکان دەریان ئەهێنان و لەناو کۆڵان و شەقامەکان سەنگەریان لێدروست ئەکرد. ئەم سەنگەرانە بە ئیسپانی پێیان ئەوترێ Barricada. هەربەم ناوەشەوە ڕۆژنامەی Barricada ی بەرەی رزگاریخوازی ساندینیستی ناونراوە. چالاکی تریان وەك شاردنەوەی پێشمەرگەو ئەندامانی (FSLN) و کۆماندانتە ناسراوەکانی سەردەمی شۆڕش بوو. لە (7/19) ەوە ڕۆژی سەرکەوتنی شۆڕش چیتر ئەرکی (CDS) کانیش گۆڕا.





**خشتی شەقامەکان، باریکادا / شۆڕشگێرەکان سەنگەریان لێدروست دەکرد**

لە کارو چالاکییەکانی ئەم ڕێکخراوە سڤیلە دوای سەرکەوتنی شۆڕش وەك شەقام و خەستەخانە دروستکردن، ڕێکخستن و هاندانی جەماوەر بۆ کاری کۆمەڵایەتی و دروستکردنەوەی وڵات.

لە کاتی مەترسی داگیرکردنی نیکاراگوا لە لایەن داگیرکەری ئەمریکی (CDS) ەکان ئەرکی بەرگری زۆریان گرتە خۆیان: پاسەوانیکردنی شەوان، باریکادە دروستکردن... ئەمانە زۆرترین کات ئەو ئۆرگانە بوو، ئەو ڕێکخراوە جەماوەرییە بوو، کە لە سەرەوە سەرکردەی نیشتمانی بڕوایان پێئەکردو کاریان ئەخستە ئەستۆیان. لێرەدا ڕۆڵی ڕێکخراوە جەماوەری و مەدەنییەکان لە وڵاتێکەوە بۆ یەکێکر تر دەبینرێ.

ئەمانە ئەرکی بەرگریکردن و ڕێکخستنی جەماوەریان دەگرتە خۆ لە شارو لادێکان بێئەوەی چاوەڕێی فەرمان بکەن لە سەرەوە. ئەرکێکی بەرگری بوو لەلایەن جەماوەرەوە دروست ئەکرا.
لە ئەرکی تری ئەم ڕێکخراوە جەماوەریە چاودێریکردنی کۆنتراکان و ئەوانەی سەر بەوان و دەناسران. مەبەست لەم کارە بۆ نەتەنینەوەی چالاکی و کاری چەواشە بوو. جەماوەر ئەم کارەیانی دەبینی و هەستی پێدەکرد. هەربۆیە گەلیش بەشداری تێدا دەکرد و پشتگیرییان لە لایەن جەماوەرەوە زۆر بوو بۆ (CDS). لە سەردەمی ڕژێمی سۆمۆزا گەل ڕێگاو مافی ئەوەی نەبوو خواست و ویستەکانی خۆی دروستبکات و گەشە پێبدات.

سەرەڕای هەموو گرفت و قەیرانەکان بەڵام گۆڕانیش بە دەست دەهێنران. قوتابخانەو خەستەخانە دروستکردن. نزیکەی هەر خێزانێك بە تایبەت لە لادێکان خانوویەکی خۆی هەیە ئەگەر کوخێکی سادەش بوبێت بەڵام بارودۆخی خەڵکی شار خراپتر بوو. لە ماسایا (MASAJA) کۆنتراکان قوتابخانەیان گڕ تێبەر ئەداو دەسوتاند، لە ناوچەکانی شەڕ قوتابخانەو خەستەخانەی زۆریان دەسووتاند. ناوچەی شەڕ ناوچەی بەپیت و بەرەکەتی کشتوکاڵەو زیانی پێدەگەیەندرا لە لایەن کۆنتراکانەوە. بەشێکی بەرچاوی هێزی دەستی کارو بەرهەمهێنەر لە ناوچەکانی شەڕ سەرباز بوون. (CDS)ەکان هەوڵیان ئەدا خەڵکی لە ناو باخ و ڕەزەکانی خۆشیاندا کشتوکاڵ بکەن و خواردن بەرهەم بهێنن. شەڕ لەو مانگانەی کە منی لێبووم توندوتیژتر بوو. کۆنتراکان لەدوای بێ ئەنجام بوونی گفتوگۆکان دەستیان



کردبۆوە بەشەڕ. قورسترین و پڕ گێروگرفترین قوناغ بوو لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشەوە.

## سەردانی ڕۆژنامەی باریکادای بەرەی ساندینیستی

دەرفەتێکم دۆزیەوە بۆ سەردانی ڕۆژنامەی ڕۆژانەی فەرمی بەرەی ساندینیستی لە ماناگوای پایتەخت. پێشەکی ئاشنابووم بە سەرنووسەری ڕۆژنامەکە. لەوێ ژنێکی سویسری لێبوو بە ناوی خۆرباتی کە هەر لەکاتی شۆڕشەوە چالاك بوو لەگەڵیانداو لە باریکادای نێودەوڵەتی ( BARICADA INTERNATIONAL) کاری دەکرد کە بە چوار زمان دەردەچوو. لەهۆڵی ئەم بەشی هەفتەنامەیە دوو وێنەی جیڤاراو لینین هەلواسرابوو. لە ڕێکەوتی 11/8 خاتوو خۆرباتی دیدارێکی تێروتەسەلی لەگەڵ کردم و ڕۆژانی دواتر لە ڕۆژنامەکەدا بڵاوکرایەوە. یەکێك لەو شتانە بریتی بوو لەو وێنەو بەلگەنامانەی کە لەئەڵمانیاوە لەگەڵ خۆم بردبووم لەسەر هەڵەبجەو بۆردومانە کیمیاوییەکەی ڕژێمی بەعس. دوای گەرانەوەم بۆ ئەڵمانیا نامەیەکی فەرمیم لە ڕۆژنامەکەوە بۆ هات (بروانە نوسراوەکە).



BARRICADA
ORGANO OFICIAL DEL FRENTE SANDINISTA DE LIBERACION NACIONAL

Managua, Nicaragua Libre. Teléfonos: 74723, 74727, 74897, 74885, 75023 – Apdo. 576

Managua, Octubre 7 de 1988.

Compañero
Salar Bassireh
[illegible] Str. 21
3550 Marburg
West Germany.-

Estimado Compañero:

Envío mi fraterno saludo.

Le informo que la entrevista dada por Usted a la Compañera Horbati ha sido de gran utilidad para que los militantes del F.S.L.N. conozcamos de la historia de lucha del pueblo Kurdo.

Esté seguro que tan importante material sirve para la educación política de nuestros militantes y el conocimiento de tan compleja, pero justa lucha del pueblo Kurdistano.

Me suscribo de Usted fraternalmente.

Responsable Relaciones
Internacionales

cc: Carlos F. Chamorro
D.R.I.
archivo

نامەی رۆژنامەی باریکادا بۆ نووسەر

وەرگێڕانی نامەکەی باریکادا بۆ کوردی

بۆ هاوڕێ سالار باسیرە ماناگوا /

7. 10. 1988

هاوڕێی بەنرخ



سڵاوێکی برایانەت بۆ دەنێرم

ئەمەوێ بۆ زانیاریت ئاگادارت بکەم ئەو چاوپێکەوتنەی هاوڕێ HORBATI لەگەڵ تۆدا ئەنجامیدا بۆ رۆژنامەی باریکادا زۆر بەکەڵکن بۆ هاوڕێیان و کادرانی FSLN، تاکو بەهۆیەوە بتوانین مێژووی خەباتی گەلی کورد بناسین. دڵنیابە لەوەی بابەت و زانیاریەکی ئاوها گرنگ بۆ پەروەردەی سیاسی ئەندامان و کادیرەکانی حیزبمان، بۆ زانیاریان وە بۆ تێگەیشتنیان بۆ پرسێکی هەرچەندە ئالۆز بەڵام خەباتی دادپەروەرانەی گەلی کوردستان گرنگە.

دوبارە سلاوی برایانەت لێدەکەم.

وێنەی بۆ:

* ARTURO ZAMORA: لێپرسراوی پەیوەندیەکانی دەرەوە.
* CHAMORO .CARLOS F دووەم گەورەترین رۆژنامە لە نیکاراگوا.
* D. R. I: حکومەت
* ئەرشیف

سێ رۆژنامەی ناوەندیی هەبوو لە نیکاراگوا (باریکادا، لاپرێنسا، نوێڤۆدیاریۆ). ئەوەی دوایی لە لاپرینسا جیابوونەوە. لاپرێنسا رۆزنامەیەکی کۆنەپەرست بوو کە پشتگیریی لە کۆنتراکان و حکومەتی ئەمریکی دەکرد. لە دیدارێکماندا لەگەڵ لاپرێنسا پرسیارەکانمان بوونە جێگای ناڕەزایی ئەوان و بە ئەنقەست کارەبایان کوژاندەوەو ئەتمۆسفێرکەیان تێکدا بۆ کۆتایی هێنان بە وتوێژەکەمان.

## ڕژێمی سۆمۆزا / ڕیفۆرمی کشتوکاڵی

سۆمۆزا خێزانێك بوو لە بنەماڵەیەك کە سیاسەتی نیکاراگوای لە ساڵانی 1934 تا 1979 بە ئامرازی زەبروزەنگی دیکتاتۆرانە لە دەستدابووە. هێزی چەکدارو میلیشیاکان ڕاستەوخۆ لە ژێر فەرمانی خۆیدا بووەو لە لایەن دارودەستەو پیاوەکانی خۆیەوە بەڕێوە براون. لە سەردەمی فەرمانڕەوایی خۆیدا سۆمۆزا سەروەت و سامانێکی زۆری پێکەوەناوە لەسەر حیسابی کوێرەوەری گەلەکەی. سوودی ماددی زۆری وەرگرت لەو یارمەتی و هاوکاریانەی کە لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی بۆ گەلی نیکاراگوا دەنێردران وەك کۆمەك ناردن لە ڕوودانی بوومەلەرزەو زۆریتر بەتایبەت لە دوای ساڵی 1972. بە شێوەیەك ئەم خێزانە لە کۆتایی ساڵی 1972 دەستیگرت بەسەر ئابوری نیکاراگوا. لە ساڵی 1979 سۆمۆزیستەکان دوای چەند ساڵێك لە شۆڕش و شەڕی نێوخۆ لە دەسەڵات ڕاونێردران و هەڵاتن. یەکێك لە نادادوەریەکانی ڕژێمی سۆمۆزا داگیرکردنی زەوی وڵات بوو لە کەرتی کشتوکاڵدا. لە ساڵی 1978 لە 82٪ی ڕووبەری زەوی و کەرتی کشتوکاڵی هی 4.9٪ی ئەو ڕژێم و بنەمالەیە بوو. 73.5٪ ی خەڵکی جوتیار خاوەن زەوی نەبوون یان تەنیا روبەرێکی هەتا حەوت دۆنمی هەبووە کە ئەمەش تەنیا بریتی بووە لە سەرجەم 2٪ ی زەوی کشتوکاڵی وڵات[3]. مێژووی مرۆڤایەتی بە ڕوونی نیشانیداوە ڕژێم و دەسەڵاتی خێزانی و بنەماڵە، کە خاوەن سروشتی سیستەمی تەقلیدی و ئۆتۆکراسین ناکرێ دەسەڵات و

[3] Nerbert greinachter / Jochen Hippler, Herausforderung im Hinterhof, Wuppertal, 1986, S.37. )



ڕژێمێکی چەوسێنەرو روتێنەرو دیکتاتۆر نەبن. هەرگیز لە سروشتی ئەمدا نییە ئازادی و دادپەروەری بهێنێت. هەرگیز ئامادە نییە بە ئامرازی سیاسی و ئاشتیانە دەسەڵات رادەست بکات و بۆ مانەوەی خۆی ئامادەیە پەنا بەرێتە بەر دوژمنانی گەلەکەشی. تەنیا رێگایەك بمێنێتەوە شۆڕشی کۆمەڵایەتیە بۆ کۆتایی هێنان پێی.

لەبەر رۆشنایی ئەو راستیە یەکێك لە گرنگترین بەرنامەکانی ساندینیستەکان بریتی بوو لە رێفۆرمی کشتوکاڵی. دوای شۆڕش ساندینیستەکان دەستیان بەسەر زەویەکانی بنەمالەی سۆمۆزاو دارودەستە زۆر نزیکەکانی گرت. لەو کاتەدا لەبەر هۆکاری خۆی دەست بۆ دەرەبەگە گەورەکانی تر نەبرا. لە 1982 حکومەت زەویە بەکارنەهێنراوەکانی دەوڵەتی دابەشکرد بەسەر جوتیاراندا یان بەسەر هەرەوەزییە کشتوکاڵیەکاندا. بەپێی یاسا گارانتی زەوی پێدان بە هەر کەسێك هەبوو بەڵام ئەگەر لەسەر زەویەکە بەرهەم بهێنێت. رێفۆرمی کشتوکاڵی زەمینەیەکی باشی خولقاند بۆ کەمکردنەوەی نادادپەروەری لە لادێکاندا. جوتیارە بچووك و ناوەڕاست و هەرەوەزییەکان چیتر دەستیان دەگەیشت بە کەرەستەو تواناکانی دەوڵەت هەروەك جارانی دەرەبەگە گەورەکان. چینی جوتیارە هەژارەکان دوای شۆڕش بوونە هێزێکی هوشیاری کۆمەڵایەتی کە نوێنەرایەتی بەرژەوەندییەکانیان بکەن لە بەرامبەر حکومەت و گروپە کۆمەڵایەتیەکانی تر بێئەوەی ترسیان لە زەبروزەنگی دەوڵەت هەبێت. هەڵوێستیان بەرامبەر بە پرۆسەی شۆڕشگێریی گەشەکردنی نیکاراگوا دەستنیشان دەکات. ساندینیستەکان

چەند جۆرێك لە سیستەمی كشتوكاڵییان پیادە دەكرد. ئەوە لە گوندی ئەل رۆزاریۆ كە من لێی ئەژیام بەم جۆرە بوو:
هەر خێزانێك پارچەیەك زەوی پێئەدرا كە خۆی كشتوكاڵی تێدا دەكرد. یان جوتیارەكە دەچوە نێو هەرەوەزی كشتوكاڵی بچووك بە چەند خێزانێك پێكەوە. ئەو خێزانەی یەكەم من لای بووم بە 24 خێزان لە هەرەوەزییەكدا پێكەوە كشتوكاڵیان دەكرد. زەویەكەیان پێكەوە دەكێڵاو بە هاوبەش كاریان تێدا دەكرد. بەرهەمەكانیان پێكەوە دابەش دەكرد و بەشێكیشیان دەفرۆشت. ئەگەر جوتیارێك نەخۆش بكەوتایە ئەوا بەرهەمەكەی خۆی هەر وەردەگرت بەو واتایەی یەكێك بۆ هەمووان و هەموان بۆ یەكێك. دەوڵەت نرخی گونجاوی پێئەدان بۆ ئەوەی لە بازاری ڕەش نەنفرۆشرێت و نرخ بەرز نەبێتەوە. زۆرێك لە خێزانەكان زەوی تاكیان نەویستوە بەڵكو بریاری زەوی كشتوكاڵی هاوبەش و بەرهەمی هاوبەشیان داوە. بەرهەمەكانیان بە زۆری قاوە، میوە، قامیشە شەكر، فاسۆلیاو برنج و گەنمەشامی بوو. حكومەتی سۆمۆزا پارەو ئامرازی بە قەرز ئەدا بە دەرەبەگەكان. جوتیارەكانیش بۆ دەرەبەگەكان كاریان دەكرد. بەڵام حكومەتی نوێ هەموو ئەوانەی بە جوتیارەكان ئەبەخشی.



## دوای شۆڕشێكی خوێناوی ساندینیستەكان لە هەڵبژاردندا دۆڕان

دۆڕاندنی ساندینیستەكان لە نیكاراگوا لە هەڵبژاردنی 1990 .9 .25 بەرامبەر ڤیۆلێتا شامۆرۆ كە لە 14 حیزبی كۆنزەڤاتیڤ پێكهاتبوو بە هاوكاری سیاسی و ماددی حكومەتی ئەمریكی / رۆنالد رێگن. ئەو چانسەی ساندینیستەكان لە دوای سەركەوتنی شۆڕش هەیان بوو بێ كێشەو قەیران بتوانن نیكاراگوایەكی نوێ دروستبكەن زۆر كورتبوو. بەتایبەت ئابلۆقەی ئابووری بووە هۆكاری تێكدانی سەقامگیری وڵات. ساڵی (1981) ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا كەوتە دروستكردنی كۆنتراكان (كۆمەلە بەكرێگیراوێك). هەر ساڵی دوای ئەوە شەڕو پێكدادانیان خولْقاند دژ بە ساندینیستەكان. لە ساڵی (1985) ئابلۆقەیەكی ئابووری گەورەشیان بەرپاكرد دژ بە نیكاراگوا[4]. خەرجی كۆنتراكان لەلایەن حكومەتی ئەمریكاوە دابین دەكرا. ئەوكاتە ململانێیەكی سیاسی لە ئەمریكا دروستبوو سەبارەت بەوەی رۆنالد رێگن لە كاتی جەنگی ئێران / عێراق بە ڕەش چەكی فرۆشتبوو بە رژێمی خومەینی و بە پارەكەی خەرجی كۆنتراكانی پێدەكرد. یەكێك لە خەمەكانی حكومەتی ئەمریكی ئەوە بوو شۆڕشی نیكاراگوا نەبێتە

[4] ئەو جەنگەی لە نێوان نیكاراگواو ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا دواجار بە رێگای كۆنتراكانەوە ئەنجامدرا ململانێیەكی توندوتیژ بوو لە نێوان سیاسەت و ئابوری و ئایدۆلۆژیای لایەنەكان. هەرچەند باس لەو جەنگە بكرێت بەلام لە راستیدا وەك هەموو جەنگەكان فاكتەرێكی گرنگ كۆلەكەكەی بوو كە بریتی بوو لە دەسەلات و ئابوری. ئاشتیش بە تەنها لایەك نەدەهاتە دی.

مۆدێل بۆ وڵاتەکانی تری ئەمریکای لاتین. لەسەر چەندین ئاست حکومەتی ڕێگن شەڕی شۆڕشی ساندینیستەکانی دەکرد: ئاستی سیاسی، ئابووری، سەربازی، سایکۆلۆژی و هەولی دابرانی نیکاراگوا لەسەر ئاستی نێودەوڵەتی. خولقانی نائارامی لە نیکاراگوا بووە هۆی ئەوەی خاوەن سەرمایەکان نەوێرن پارە بخەنە کارەوە یان پارەکانیان دەگواستەوە بۆ وڵاتەکانی تری ئەمریکا بۆ وەبەرهێنان. قەیرانی ئابووری قەیرانی سیاسیش دروستدەکات. هێزێکی زۆری دەستی کار دەبوایە سەرقاڵی چەك هەڵگرتن و بوونە سەربازو چوونە بەرەکانی شەڕەوە بن. ئەوەش بێگومان کاریگەریی دەکاتە سەر باری کۆمەڵایەتی و خێزانیش، کە کۆڵەکەو بنچینەی کۆمەڵایەتیەو ئەم جۆرە قەیرانە لاسەنگی کۆمەڵایەتی دروستدەکات. نیکاراگوا عێراق و ئێران نەبوو خاوەنی سامانێکی زۆری نەوت بێت. پاش چەندین ساڵ بارودۆخەکە گەیشتە ئەوەی ساندنیستەکان ناچاربن دان بە بەشێکی بەرچاوی دواکارییەکانی حکومەتی ئەمریکی و کۆنتراکان بنێن ئەوەش لە پێناوی حەل کردنی کۆنتراکان. ئەو کۆنترایانەی خاوەن ئایدۆلۆژیا نەبوون و بەکرێ گیراوبوون. بەڵام ساندنیستەکان لە خەباتیاندا دژ بە کۆنتراکان توانیان خاڵی سەرکەوتنیش بە دەستبهێنن بۆ چارەسەرکردنی ئەو تاقمە بەکرێ گیراوانە، بەڵام نرخی ئەوەی کە ساندنیستەکان دایان بۆی ئەوە بوو لە کۆتایدا دەسەڵاتیان لە دەستدا. خەڵکیی ئەمجارە لە پێناوی کۆتایی هێنان بەو میحنەتە گەورەیەی تێی کەوتبوون هیوایان بەوە خواست بە هەڵبژاردنی پارتەکەی ڤیۆلێتا شامۆرۆی سەر بە ئەمریکای سەرو ئەو ئابلوقە ئابوورییە لەسەریان لابرێت و کۆتایی بە جەنگ بهێنرێت. ئەوە لێرەدا دەنگدان بوو بە گەدە نەك بە فکرو مێشك.





**پارتیزانە ژنەکانی بەرەی رزگاریخوازی نیکاراگوا**

ساندینیستەکان بوونە ئۆپۆزسیۆن بەڵام ئۆپۆزسیۆنێکی بەهێز وەك خۆیان وتەنی لە بنەماوە حوکمیان دەکردو ناوچەیەکی زۆری نفوزو هێزی ساندینیستەکان هەبوو بەتایبەت لە لادێکانداو لە نێوان جوتیاراندا چونکە ساندینیستەکان ڕێفۆرمی کشتوکاڵییان لە بەرژەوەندی جوتیاران ئەنجامدا. سەرۆکی بەرەی ساندینیستی (دانێل ئۆرتێگا) بەماوەیەکی کورت دوای هەڵبژاردنەکە ئاشکرای کرد (FSLN) بە هیچ جۆرێك ڕێگا نادات ئەو دەستکەوتە گرنگانەی بەخوێن و شەهیدانیان بە دەستیان هێناوە لە دەستی بدەن و دەستی لێهەڵبگرن. ڕێفۆرمی کشتوکاڵی ناکرێت بە هیچ جۆرێك ڕەت بکرێتەوەو تێك بدرێت. لەبەر ئەوەی حکومەتی نوێی ڤیۆلێتا شامۆرۆ وەك پێویست جیهازی دەوڵەتی بە دەستەوە نەبوو بە هیوای زەمان کردنی دەسەڵاتەکەی ناچار بوو لە دوای سەرکەوتنی لە هەڵبژاردندا مەرجەکانی (FSLN) قبوڵ بکات و بچێتە گفتۆگۆوە لەگەڵیدا. ئەو

حکومەتەی شامۆرۆ پێویستی بەوە هەبوو ساندینیستەکان دەسەڵات رادەست بکەن بێئەوەی بارودۆخێکی نالەبار دروستبکەن، چونکە ساندینیستەکان دەیانتوانی سەقامگیری هەموو دەوڵەت تێکبدەن بەڵام نەیویست شەڕی نێوخۆ دروستبکات بۆ ئەوەی حکومەتی ئەمریکی بێزار نەکات و بە هێزی سەربازیەوە نەیەتە ناو نیکارگوا. بەڵام ئێستە لە هەڵبژاردنەکانی ئەم دواییە لە 6.11.2011 ساندینیستەکان لە هەڵبژاردنەکاندا بردیانەوەو دەسەڵاتیان گرتەوە دەست. لە 60٪ی دەنگەکانیان بەدەستهێنا. دژەکەی ئۆرتێگا 31٪ی دەنگەکانی بەدەستهێنا[5]. لە هەڵبژاردنی 1990 ساندینیستەکان 40.8٪ ی

[5] FSLN / بە ئیسپانی ( Frente Sandinista de Liberación Nacional) بەواتا بەرەی نیشتیمانی ڕزگاریخوازی ساندینیستی. لە 23.7.1961 وەك رێکخڕاوێکی چەپ دروستبوو دژ بە رژێم و بنەمالەی سۆمۆزاو لە 19.7.1979 دوای شۆرشێکی خوێناوی دەسەلاتی سیاسی گرتە دەست. بنەما کۆمەلایەتیەکەی ئەم رێکخراوە سیاسیە بریتی بوو لە جوتیاران ، کرێکاری کشتوکالی ، کرێکارانی کارگەو سەندیکاکان ، بێکاران، خاوەن سەنعەتە محەلیەکان ، توێژی رۆشنبیران... بەرەی ساندینیستی لە سەرەتادا لە سێ بال پێکهاتبوو ( بالی پرۆلیتاریا ، بالی ڕاپەڕین کە بالێکی فرە گروپ بوو لە سۆشیال دیموکرات / هیومانیستەکان/ مەسیحیەکان/ ئەنارشیستەکان ، هەروەها بالی سێیەم درێژکەرەوەی جەنگی میللی بە کاریگەریی جیڤارا و کوبا لەسەری و ڕەخنەگری سیاسەتی مۆسکۆی یەکیەتی سۆڤیەت بوو). هەربۆیە لە سەرەتادا یەکێتیەکی فکری لە نێو ئەو بەرەیەدا نەبوو بەلام ئێستە ئەو بالانە کال بونەتەوەو زۆرتر باس لە بەرگری نەتەوەیی و نیشتیمانی دەکرێت. سەرکردەی نیشتیمانی ئەم بەرەیە بریتی بوو لە نۆ کەس. رێفۆرمی کشتوکالی لە بەرنامە گرنگ و سەرەکیەکانی بەرەی ساندینیستی بوو بۆ ولاتێکی کشتوکالی. بەدیهێنانی شۆڕشێکی سۆسیالیستیی ئامانجی کۆتایی



دەنگەکانی بەدەستهێنا بەرامبەر بە 55.2٪ی دژەکانی. حکومەتی دژە ساندینیستەکان نەیتوانی پەیمانەکانی دابوویان بە گەل جێبەجێی بکەن و حکومەتی ئەمریکیش بەردەوام بوو لەسەر سیاسەتی دوژمنکارانەی پێشنەکەوتنی نیکاراگوا.

## ئەمریکای لاتین

دابەشکردنی جوگرافی ئەمریکای لاتین هەروەك بەشەکانی تری "جیهانی سێ" ئەفەریقاو ئاسیا لە کۆمەڵێك دەوڵەتی دەستکرد دروستکراوە بەپێی بەرژەوەندی سیاسی و ئابووری دەوڵەتە کۆلۆنیالیستەکان. لە دەوڵەتەکانی ئەمریکای ناوەراستەوە پێیدا برۆین کە بریتین لە حەوت دەوڵەت (بیلیتیزا، گواتیمالا، هۆندۆراس، سەلفادۆر، نیکاراگوا، کۆستاریکا، پەنەما). وڵاتەکانی ئەمریکای خواروش کە دەست پێدەکات بە (ڤەنزوێلا، کۆلۆمبیا، سورینامە، بەرازیل، پیرۆ، بۆلیڤیا، ئەرجەنتین، شیلی، ئۆرۆگوا و ئیکوادۆر).

ساندینیستەکان بوو بەلام کێشە لە مەرجە ئابوری و سیاسیەکاندا هەبوو ، مەرجە نێوخۆیی و دەرەکیەکان بە تایبەت مەرجە دەرەکیەکان.




**نەخشەی ئەمریکای لاتین**

بەرازیل گەورەترین رووبەری جوگرافی هەیە لە ئەمریکای لاتین و جگە لەم بە زمانی پورتوگالی قسە ئەکەن چونکە کۆلۆنیزەی پورتوگال بوو چیتر هەموو ئەمریکای لاتین بەزمانی ئیسپانی قسەدەکەن بەڵام زمانی پورتوگالی و ئیسپانی زۆر دورنین لە یەکترەوە هەروەك زمانی کوردی و فارسی. نزیکەی 400 ملیۆن مرۆڤ ئەمرۆکە بە زمانی ئیسپانی قسە دەکەن. ئەمریکا بەگشتی کیشوەرێکی لە رووی جوگرافییەوە داخراوە. هەموو رووداوێك و گۆڕانکارییەك بەگشتی کاریگەری و رەنگدانەوەی خۆی هەیە لەسەر بەشەکانی دیکەی ئەم کیشوەرە. ئەوەش بە حوکمی زمانەکەی، کەلتوور، نەریت و ئاین و جوگرافیاکەی هەروەها مێژوویەکی هاوبەش و بارودوخە



ئابوورییەکەی. ئەمریکای لاتین بەکیشوەری شۆڕش و برسیەتی ناسراوەو بەراورد ناکرێ بە ئاسیاو رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە زۆر ئاڵۆزترەو ناوچەیەکی فرە نەتەوەو فرە ئاین و مەزهەب و فرە کەلتوری جیاوازە.

## گرنگی ئەمریکای ناوەڕاست و ناوچەی کاریبی بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

ئەمریکای ناوەراست کە بریتیە لە حەوت دەوڵەت بە رووبەرێکی کەمەوەو چڕپی دانیشتوانەوە ئەو پردە زەوییەیە کەوتۆتە نێوان سەرو و خواری کیشوەری ئەمریکا هەروەها لە نێوان هەردوو ئۆقیانووسی ئەتڵەسی و ئارام ناوچەیەکی گرنگی هاتوچۆی پاپۆرە بۆ ئەمریکای سەروش هەربۆیە دەیەوێ دەسەڵاتی بەسەر ئەم ناوچەیەدا بهێڵێتەوە بۆ مەبەستە ستراتیژیەکانی. جگە لەوە بۆ ئەمریکای سەرو ناوچەیەکی بە واتایە سەبارەت بە هەرزانیی و هاوردەکردنی خواردەمەنی وەك شەکر، قاوە، مۆز، گۆشت... هەر لێرەدا دەبێت گرنگی قەناتی پەنەما، هەروەها توانای دروستکردنی قەناتێك لە نێوان ئۆقیانووسی ئەتڵەسی و ئارام لە سەر زەوی نیکاراگوا، یەدەگی نەوت لە ناوچەی کاریبی کە مەزەندە دەکرێت بەوەی زۆرتر بێت لە سەرجەم یەدەگی نەوت لە سعودی عەرەبی و ناوچەی کەنداو. لەبەر رۆشنایی ئەو گرنگیە دەبێت سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکای سەرو لەم ناوچەیەش ببینرێت. لە 25٪ی ئەو نەوتەی هەناردە دەکرێت بۆ ئەمریکای سەروو لە

ناوچەی کاریبی دەپاڵێورێت. ئەو وڵاتانەی ئەمریکای ناوەڕاست و کاریبی بە
کوباو و هایتی و گرێناداو جامایکاو دورگەکانی دۆمێنیکان کەوتونەتە
ناوچەیەکەوە کە بۆ ئەمریکای سەرو بایەخ و واتایەکی ستراتیژی هەیە.
بەشێکی گەورەی بازرگانی دەرەوەی ئەمریکای سەروو بە ئاوی کاریبیدا
دەڕوات. لە بارودۆخی جەنگدا نیوەی هەناردەکردنی پێداویستییەکان بۆ
ئەوروپا هەر بەم ئاوی کاریبیدا تێدەپەڕێت. ستراتیژیەتی ئەمریکای سەروو
لە ئەمریکای ناوەڕاستدا بەواتای داگیرکاری ئەم ناوچەیە دێت. مێژووی
سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەسەرجەم ئەمریکای
لاتین بریتیە لە مێژووی رووتاندنەوەو کۆلۆنیزەکردن بەرامبەر بە گەلان و
وڵاتانی ئەم ناوچەیە بە ناوەڕاست و خواروی ئەمریکاو ناوچەی کاریبی.
مێژووی گەلانی ئەمریکای لاتینیش مێژوی شۆڕش و راپەرین بووە بۆ ئازادی
و دادپەروەری. سیاسەتی ئەمریکا سیاسەتی دەستبەسەردا گرتنەو بۆ ئەم
مەبەستەش کۆمەڵێك لە ئامرازی بەکارهێناوە: سیاسی و سەربازی و
ئابوری. گەورەترین زلهێزی جیهان کە ئەمریکای سەرووە بچوکترین دورگەی
لە کاریبی کە گرینادایە بە هێزی سوپا داگیرکرد. لە شەستەکاندا بە هێزی
سوپا دوورگەکانی دۆمینیکانیان داگیرکرد، چەند جارێك نیکاراگواو کوباو
سەرووی مەکسیکیان داگیرکردوە، دواجار پەنەما. هەرەشەی سوپا لەسەر
کوبا هەمیشە بەردەوام بووە. ئەمانەش دوا توندوتیژی ئەمریکای سەرو نییە
لەم ناوچەیەشدا. ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ئەمریکایەکی بەهێزی
دەوێت لە "جیهانی سێ "دا. سیاسەتی دەرەوەیان لە ئایندەشدا لەسەر
هێزو بەرفراوان کردنی سەربازی دەبێت. لە نێو بەرەی سەرمایەداریدا دیارە
کەس ناتوانێت نکۆڵی لە رۆڵی ئەمریکای سەروو بکات. بەڵام ئەمڕۆکە



ئەمریکا پێویستی بەهاوپەیمان هەیەو دوای ڕوخانی یەکێتی سۆڤیەت فرە
جەمسەری هاتۆتە کایەوە. لە ئەمریکای لاتین بێت یان لە کیشوەرەکانی
تری "جیهانی سێ" بێت ئەمریکاو رۆژئاوا بە گشتی ئەم ناوچانەی بۆ ئەم
بەرژەوەندیانە ویستووە:

سەرچاوەی کەرەستەی خاو.

بازاری ساغکردنەوەی شمەك.

وڵاتانی دەستی کاری هەرزان.

وەبەرهێنان بە ئامانجی قازانجی زۆر.

وەك بنکەی سەربازی و جیۆستراتیژی بۆ چاودێری کردن و هەڕەشە.

من وای دەبینم ئیمپریالیزم بە شێوەیەکی بەرچاو بەندە بە وڵاتەکانی
"جیهانی سێ" لەگەڵ ئەوەشدا ئەم زلهێزانە توانیویانە ئەم پابەندبوونە
بەرێگای سوپاو زەبروزەنگ و چەوساندنەوەی سیاسی و ئابووری و
ترانسفێری تەکنەلۆژیاوە پێچەوانە بکەنەوە. لەم سێ کیشوەرە برسیەتی لە
گەشەکردندایەو سەروەت و سامانەکەشیان رۆژانە ڕووت دەکرێتەوەو
پشتگیری سیستەمە سیاسییە دیکتاتۆرە خۆماڵیەکان دەکرێت. ئەم
زلهێزانە بۆ ئەوەی یەخەی کراسەکانیان پاك بهێڵنەوە بەرژەوەندییەکانیان
بەرێگای گرێبەستی دەوڵەتی و یاسای نێودەوڵەتیەوە گرەنتی کردووە.
دامودەزگا دروستدەکەن، کە رووتاندنەوەکان دامودەزگایی رێك بخەن.
سندوقی دراوی نێودەوڵەتی نموونەیەکی بەرچاوە. لەگەڵ ئەمانەشدا
کۆلۆنیالیزم خۆی لە خوێن رشتن و جەنگ لانادات. کۆلۆنیالیزم و
ئیمپریالیزم یەکناگرنەوە لەگەڵ ئازادیداو گەلانی چەوساوەش بەرگری

کردنیان کردۆتە ریبّازی خۆیان. ئەمانە بۆ مانەوەیان وەك زلهێز لە رووی سەربازییەوە پێویستییان بە کەرەسەی سەربازی هەیە لە میتالەوە هەتا زۆری کەش، بۆ ئەم مەبەستەش پەلاماری دەوڵەتە بێهێزەکانی وەك "جیهانی سێ" ئەدەن. کۆمەڵە رژێمێکی دیکتاتۆر دەهێننە سەر حوکم و پشتگیریی لێدەکەن بۆ مانەوەو بە رێگای ئەوانەوە بەرژەوەندییەکانی خۆیان دەپارێزن. لێدانی شۆڕشی نیکاراگوا نمونەیەکی بەرچاوەو ترسی ئەوەیان هەیە ئەم شۆڕشە پەل بکێشێت بۆ وڵاتەکانی تری کیشوەرەکە. بەرهەمەکانی ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا زۆرتر دەنێردرێنە وڵاتە دواکەوتوە، یان تازە گەشەکردووەکان وەك لە هەناردەکردنی بۆ ئەوروپا.




**حەوت دەوڵەتەکەی ئەمریکای ناوەراست : بیلیتیزا، گواتیمالا، هۆندۆراس، سەلفادۆر، نیکاراگوا، کۆستاریکا، پەنەما). مەکسیك وەك ئەمریکای ناوەراست حیساب نەکراوە.**



## گرنگی ئەمریکای لاتین بۆ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا

هەموو وڵاتەکانی ئەمریکای لاتین وەك یەك نین. ڤێنزوێلا وڵاتێکی ئابووری گرنگترە چونکە نەوتی هەیە. هەروەها مەکسیك نەك هەر کەرەسەی خاو و نەوتی هەیە بەڵکو وڵاتێکی گرنگە وەك بازاڕێك بۆ ساغکردنەوەی کەل و پەلە بەرهەم هێنراوەکانی ئەمریکای سەروو، هەروەها پەیوەندی بازرگانی گرنگیشی هەیە لەگەڵیدا بەڵام مەکسیکی خاوەن ژمارە زۆرێکی دانیشتوان بۆتە وڵاتێکی هەژارکەوتوو،  دیارە یەکێك لە هۆ گرنگەکان بریتیە لە سیستەمە سیاسی و ئابوریەکەی. زۆر جار لە مەکسیکەوە کە سنووری هەیە بە ئەمەریکای سەروو خەڵکێکی زۆر لێرەوە بە قاچاخ هەولی چوونە نێو ئەمریکای سەرو دەدەن. دیوارێکی گەورەو درێژ لە نێوان سنووری هەردوو ئەو دەوڵەتەدا لە لایەن ئەمریکای سەرو دروستکراوەو بە ئامێری پێشکەوتوو چاودێری دەکرێت بۆ رێگاگرتن لە مەکسیکییەکان بۆ پەڕینەوە بۆ ئەمریکای سەروو لە پێناوی ئیش کردن و بژێوی ژیاندا ژیانی خۆیان دەخەنە مەترسییەوە. زۆربەی زۆری بەرووبومی ئەمریکای لاتین بەرەو ئەمریکای سەرو دەروات. بینیم کە شەقامێکی 4000 هەزار کیلۆمەتر لە ئەمریکای لاتینەوە بۆ ئەمریکای سەروو دروستکراوە بۆ مەبەستی سەربازی و ئابووری و بازرگانی. دارستانەکاتی ئەمازۆنیش بەر ئەم خواستە کەوتووە کە بۆتە هۆی وێرانکردنی بەشێکی بەرچاوی ئەو دارستانە مەزنە کە بۆ

ژینگە پێویستییەکی ژیانییە کەواتە لێرەدا جەنگێکیش بەرپاکراوە دژ بە ژینگە. لێرەدا نادادپەروەری دەبینرێت لە بازرگانی نێودەوڵەتیدا.

زۆربەی ئەو حکومەتانەی لەم ناوچەیەدا فەرمانڕەوایی دەکەن زیاتر سەر بە ئەمریکای سەروون و پشتگیری سیاسی و سەربازی و مادییان دەکرێ. $3/2$ی سەروەتو سامانی وڵاتەکانی "جیهانی سێ" کە بریتین لە ئەفەریقاو ئاسیاو ئەمریکای لاتین بەواتا سێ کیشوەرەکەی خواری گۆی زەوی دەرژێتە چەند دەوڵەتانێکی کەم لە رۆژئاوای ئەوروپاو ئەمریکای سەروو. سەبارەت بە ئاین، مەسیحیەت لە ئەمریکای لاتین زالە، ئەم دینە کاتی خۆی داگیرکەرانی کولۆنیالیزمی ئەوروپایی گواستویانەتەوە بۆ ئەمریکای لاتین. سەرکردەی کەنیسەکان دەزگایەکن رۆلی خراپیان بینیوەو باجی سەندووەو پشتگیریکەری گەلی هەژار نەبووە. کەنیسە کاتی خۆی پشتگیری لە بازرگانیی کۆیلە کردووە. تەنانەت لە نیکاراگواش پشتگیرییان لەو سیستەمە سیاسیانە کردووە دژ بە بزووتنەوە رزگاریخوازەکان، بەڵام لە کاتی شۆڕشدا بەشێکی بەرچاو لە قاعیدەی کەنیسە چوونە پاڵ شۆڕشی ساندینیستی.



## کۆچی لاتینەکان بۆ ئەوروپا و مێژووی کۆیلایەتی

ئەگەر کەسێك بۆنموونە بچێتە هوڵەندا تێبینی ئەوە دەکات کە ڕەش پێستێکی زۆر لەوێ دەژین، کە زۆربەی خەڵکی وڵاتی (سورینامە)ن. ئەم وڵاتە، کە کەوتۆتە ئەمریکای خوارو کاتی خۆی کۆلۆنی هوڵەندە بووە. ئەم خەڵکانەیان بردۆتە هوڵندە بۆ ئیشکردن و ئیدی لەو کاتەوە ژمارەیان زیادی کردووەو ئێستا نەوەیەکی نوێی لێدروست بووە، کە زۆرتر هەستی هوڵەندی تێدا هەیە وەك لەو هەستە نەتەوەییەی کە بۆ وڵاتەکەی خۆی نەیماوە. دیارە نەوە لە دوای نەوە گۆڕانکاری زیاتری بەسەردا دێت. هەمان دیاردە لە فەڕەنساش یان ئیسپانیا بەدی دەکرێ. بەتایبەتی لە فەڕەنسا خەڵکێکی زۆری جەزائیری و تونسی لێیە. هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئەو وڵاتانەی ئەفەریقای سەرو بۆنموونە جەزائیر کاتی خۆی کۆلۆنی فەرەنسا بوون و بەم هۆیەوە خەڵکێکی زۆری ئەو وڵاتانە کۆچیان کردووە بۆ فەڕەنسا، یان براون بۆ کارو دواتر لەوێ ماونەتەوە. زمانی فەرەنسی زمانێکی زالە لەو وڵاتانە. هندە سورەکان ئەو هێزوتوانایەیان نەبووە بۆ کارکردنی قورس بە بەراورد بە ئەفەریقیەکان هەربۆیە رووکرایە کیشوەری ئەفەریقاو ڕەش پێستێکی زۆر وەك کۆیلە گواسترانەوە ئەمریکاو بەم هۆیەوە بازرگانی کۆیلە دروستبوو[6].

[6]) کۆیلایەتی واتە فەرمانرەوایی مرۆڤێك بەسەر ئەوی تردا لەوەی کە کۆیلەکە دەبێتە شمەك. شمەکەکە وەك رۆح لەبەرێك دەرفەتێکی ئازادیی تێدا هەیە بەلام سنوردار دەکرێتو وەك شمەکێك چاودێری دەکرێ ، وەك ئەوە وایە ببەسترێتەوەو شتێکی قورسی پێوە ببەسترێت. کۆیلایەتی دەتوانرێ لەشتێکی رۆح لەبەرەوە بکرێتە بتێکی نەجولاو ، کۆتاییەکەی دەبێتە کۆیلەیەکی مردوو. بەمە کۆیلەکە دەگاتە سنورێك کەخۆی خۆی وێران دەکات. خاوەنی کۆیلەکە خاوەنە بەرامبەر بە بریاری ژیان و مردن. کۆیلەکە زۆرجار بەندی جەنگ بوو. ژیانی دیاری

ئەگەر لە ڕووی جوگرافییەوە لێی بڕوانین دەبینین ئەفەریقیا لەوبەری ئەمریکای لاتینیەوەیەو ڕاستەوخۆ بە ئۆقیانووسەکەدا بە پاپۆڕی گەورە کۆیلەکانیان گواستۆتەوە ئەمبەرەوە. لە سەرەتادا لە سەروی بەرازیل نیشتەجێیان کردوون چونکە ئەفەریقیەکان بەرەنگاریی گەرمایان زیاتر کردووە. ئێستا ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی پێست ڕەش لە ئەمەریکای لاتین و سەرووش هەن. من کە لە نیکاراگوا بووم لە ڕۆژنامەی باریکادا پیاوێکی لێبوو لە بەشی کاروباری دەرەوەدا بەرپرسیارێتی هەبوو ناوی (عەبدول) بوو چونکە بە ڕەچەڵەك دەگەڕایەوە بۆ ئەو ئەفەریقیانەی ئەو زەمەنە وەك کۆیلە هێنرابوونە ئەمریکای لاتین و ڕەچەلەکەکەی موسوڵمان ئایین بوە. ئەو باسی بۆ دەکردم ڕەش پێست بوون بەڵام بەهۆی ژن و ژنحوازیەوە لەگەڵ سپی پێستەکاندا بە هۆی جینەوە ڕەنگی هەندێکیان کاڵتر بۆتەوە..

---

دەکراو بەمەش دەکرایە کۆیلە. بۆ ئەم دیاری ژیانە کۆیلەکە دەبوایە کار بکات. ئەم دیاریەی کە ئەیدرایە دەتوانرا لێشی بسەندرێتەوە. ئەم کۆیلانە وەك دەسکەوتێکی سروشت سەیردەکران ، وەك کەرەسەیەکی خاوی سروشت. جگە لە ڕۆماو یۆنانییەکان ئەوروپیەکان (هۆلەندی و بەریتانی و ئیسپانی و پورتوغالیەکان...) بازرگانیکەری سەرەکی کۆیلە بوون لە ولاتە ئەفەریقیە جیاوازەکانەوە. ئەم هێزانە سروشت و میلەتانی زۆربەی "جیهانی سێ"یان وێرانکردو بەشێکی بەرچاوی دەولەمەندی ئەمرۆیان لەسەر حیسابی کوێرەوەری ئەمانە دروستبوو. ئەو جیاوازیانەش کە ئەمرۆ لە ئابوری و هەژاری و دەوڵەمەندیدا ، لە بەرهەمهێنان و بازرگانی و نایەکسانیدا ماوەتەوە بەرهەمی ئەو کاتەیە هەتا ئەمرۆش درێژەی هەیە. بە دەیان جەنگ لە مێژوودا بەرپاکراوە بۆ مەبەستی بەدیل گرتنی پیاو و ژن و مندال و کردنیان بە کۆیلە.





**ژیانی هندیە سوورەکان**

## گەشتی بەرازیل

لە ڕاستیدا دەمویست لە ئەمریکای ناوەڕاستەوە گەشتی بەرازیل بکەم بەڵام کات و پارە بەشی ئەو گەشتەی ئەوێی تێدا نەدەبوو. ئەو کاتی گەشتەکەم هێشتا خوێندکاری زانکۆ بووم. پێشتر لە کارگەیەك ماوەیەك کارم کرد بۆ کۆکردنەوەی خەرجی ئەو گەشتە. بەرازیل وڵاتێکە دانیشتوانەکەی (192) ملیۆن کەسەو گەورەترین وڵاتی ئەمریکای لاتینەو ئابووری و پیشەسازییەکی گەورەی هەیەو ڕۆڵی زلهێزێکی هەرێمایەتی دەبینێت لە ئەمریکای لاتین. بە ملیون منداڵی هەژار لەسەر جادە دەژین. لە ناوچەی زۆر گەورەدا ڕووەکی سۆیای تێدا دەڕوێنرێت و وەك عەلەفی ئاژەڵ

بەکاردەهێنرێن لە وڵاتەکانی ڕۆژئاوای ئەورووپا لە کاتێکدا لەم وڵاتە برسیەتی هەیە. لە شاری سان پاولۆ نزیکەی 60٪ی سەرمایەی ئەو شارە هی دوانزە سەرمایەداری گەورەی ئەڵمانیای ڕۆژ ئاوایە بە دەستی کاری هەرزان بەرهەمەکان هەرزان دەکەون بێ هەبوونیی بیمەی کۆمەڵایەتی و تەندروستی. بۆ نموونە ئەگەر جوتێ پێڵاو بکڕم لە ئەڵمانیا لەسەری نووسراوە (لە ئەلمانیا دروستکراوە) بەڵام ڕاستیەکەی لەوانەیە لە بەرازیل یان لە ئەفەریقا دروست کرابێ لەوانەیە بەهەمووی 10دۆلاری تێنەچووبێت، بەڵام بە چەند جارێك زیاتر دەفرۆشرێتەوە لە ڕۆژئاوا.



**بەرازیل لەسەر نەخشەی جیهان**



## گەشتەکەم بۆ کــوبا

دوای گەشتەکەم لە ئەمریکای ناوەڕاست، لە ماناگوا سواری فرۆکە بووم بۆ هاڤانا پایتەختی کوبا. پاش نزیکەی کاتژمێرێك و پێنج خولەك شارێکی گەورەی جوانم لە ئاسمانەوە بینی و کەوتمە وێنەگرتنی، بەڵام شێوەی جوگرافیاکەی گومانی بۆ دروستکردم ئەوە هاڤانا بێت. کاپتنەکە ئاشکرایکرد دوای چەند خولەکێکی تر دەگەینە پەناماسیتی پایتەختی وڵاتی پەنەما. پێشتر ئاگادار نەبووم دەڕۆینە پەنەما. لەوێ سەرنشینی تریان هەبوو. لە ئاسمانی پەناما وێنەی قەناتی پەنەمام گرت. کاتی خۆی ئەم شوێنە هەڵکەندراوەو ئۆقیانووسی ئەتڵەسی و ئارام پێکەوە گرێداوە بە درێژیی 82 کم و یەکێکە لە گرنگترین شەقامە ئاوییەکانی جیهان. ناوچەیەکی گرنگە بۆ ئەمریکای سەروو (ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا) لە ڕووی سەربازی و ئابووریشەوە.




**کەناڵی پەنەما (هەردوو ئۆقیانووسەکەی پێکەوە گرێداوە)**

که هاتمە هاڤانا نزیکەی مانگ و نیوێك مامەوە هەر لە باکووریەوە هەتا باشووری گەڕام. یەکێك لەو شتانەی سەرەنجی ڕاکێشام بریتی بوو لە مۆزەخانەیەکی گەورە لە هاڤانای پایتەخت بە ناوی مۆزەخانەی شۆڕش. مۆزەخانەی شۆڕش مێژووی شۆڕشی کوبای سەردەمی گیڤاراو فیدڵ کاسترۆش بوو دژ بە ڕژێمی باتیستا. مۆزەخانەکە لە دۆزینەوەی دورگەی کوبا دەستپێدەکات کە دانیشتوانی بەڕەچەڵەکی ئەم ناوچەیە هندیە سوورەکان بوون. سەردەمی ڕاو و شوانی و بە قۆناغی کشتوکاڵیدا ڕۆیشتوون و ئەم شوێنانەی ژیانیان هەمووی لەسەر دەریا بووە. بۆیە پێیان دەوترێ هندیە سوورەکان چونکە ڕەنگیی پێستیان سورە. سێ جۆر ڕەنگی مرۆڤ هەیە ڕەش و سپی و سوور. ئەم مۆزەخانەیەم بە دوو ڕۆژ تەواو کرد چونکە گەورە بوو. ویستم بە وردی پیایدا بگەڕێم و بیبینم.



**مۆزەخانەی شۆڕش لە هاڤانا / کوبا**



هەر دوو ئەسپەکەی گیڤاراو فیدل کاسترۆ تەحنیت کرابوون کە کاتی شۆڕش بەکاریان هێناوە. تفەنگەکەی گیڤاراو کراسە خوێناویەکەی لەناو شووشەیەکدا دانرابوو. هەروەها ئەو دەزگای چاپەمەنییەی کاتی خۆی لە شاخ بەکاریان هێناوە.



**تفەنگەکەی گیڤارای کاتی شۆڕش**



**پەیکەرێکی گیڤارا لە مۆزەخانەی شۆڕش / کوبا**






**گیڤارا دوای شەهید کردنی لە پۆلیڤیا**

لە نیکاراگواش لە شاری لیۆن سەردانی مۆزەخانەیەکی ئەوێشم کرد بە هەمان ناو بەڵام هەرگیز بەراورد نەدەکرا بەوەی کوبا. کوبا وڵاتێکی زۆر پێشکەوتووتر بوو لەوەی من بیرم لێدەکردەوە. کوبا بە پێی پێناسە فەرمیەکە دوورگەو دەوڵەتێکی کۆماری، سۆسیالیستی تاك حیزبیە. دەسەڵات ناوەندییەو نەخشەی ئابووری (5)ساڵەیان پیادە دەکرد. هەموو ئەو کەلوپەلانەی من تێبینیم دەکردن یەك جۆرو یەك نرخ بوو لە بازاڕدا. هەمووی لە لایەن دەوڵەتەوە بەرهەم دەهێنرا. نیکاراگوا بەپێچەوانەوە سیستەمی ئابوورییەکەی تێکەڵ بوو. تێکەڵییەکی سەرمایەداری و سۆسیالیزم. کارگە گەورەکان یاخود ئەوانەی کە نەدەتوانرا ببرێن بەڕێگاوە لە لایەن خاوەنەکانیانەوەو بەرەو داخستن دەڕۆیشتن بە دەوڵەتی دەکران.

بە هەمان شێوە بازرگانیی دەرەوەو بانك دەوڵەتی بوون بەڵام ئەم سیستەمە هەتاسەر ناكرێ بەم شێوەیە بروات. لە كوبا فرۆشیاری سەر جادەم نەدەبینی، سواڵكەرم نەدەبینی، قەدەغەبوو خەڵك لەسەر جادە بكەوێت یان بنوێت. لە كوبا (3) جۆر لە سیستەمی تەكسی هەبوو. هەندێك تەكسی هەبوو بە دۆلار بوو بۆ توریست. بۆ ئێمە گران نەبوو، زوو ئەگەیشتە لات. تەكسی هەبوو بە كۆمەڵ خەڵكی دەگواستەوە. من رۆشتمە دورگەی ڤارادێرۆ لەوێ لەگەڵ كچێكی ئاشنای ئەڵمانم شوقەیەكی مۆدێرنمان گرت بەكرێ بۆ پێنج رۆژ. رۆژی بە (16) دۆلاری ئەمریكی. ڕاستەوخۆ لەسەر قەراغی ئۆقیانووسەكە بوو. بەراورد بە پارەی رۆژئاوا گران نەبوو. من دوای چەندین مانگی ژیان لە بینینی ناخۆشی و هەژاری لە ئەمریكای ناوەڕاست و بەتایبەت لە نیكاراگوا یەكەم جاربوو وەك تۆریست رۆشتمە كوباو لەوێ پشوویەكمدا. دانیشتوانەكەی ئەمڕۆكە یازدە ملیۆن كەسەو بەسەر سەرجەمی دورگەكەدا بڵاوبۆتەوە. گەورەترین شاری كوبا (هاڤانا)یە، پایتەختیشە لە هەمانكاتدا. دووەم گەورەترین شاری كوبا پێی دەڵێن سانتیاگۆ دێكوبا بە پێچەوانەی هاڤاناوە تەواو لە خوارووی كوبایە.





**دوورگەی كوبا**

شەقامەكانی كوبا ئەوەی من بینیمن هەمووی جوان و ڤیرتاوكراو بوون. بەگشتی وڵاتێكی پاكو تەمیزەو شارو شوێنەكان جوانن و بایەخی زۆریان داوە بە شوێنی زانستی و مۆزەخانەو شوێنی تۆریست هەرچەندە كێشەی ئابووریشیان زۆرەو دەیان ساڵە ئابڵۆقەی ئابووری بەتایبەت ئەمریكای سەرووی لەسەرە. تۆریست سەرچاوەی ئابووری دوەمی كوبایە هەربۆیە بایەخ بەم كەرتە ئابوورییە دراوە. موچە ئەو كاتە بە گشتی لە نێوان (200 ـ 250) پێزۆز بوو. لە هەموو خێزانێكا بەلایەنی كەمەوە دوو كەس موچە خۆربوون و كاریان دەكرد بۆ دابینكردنی بژێوی ژیان.

# کردنەوەی مۆزەخانەی شۆڕش لە کوردستان

ئێمەش لە باشووری کوردستان پێویستیمان بە مۆزەخانەیەکی لەم جۆرە هەیە بەهەمان ناو (مۆزەخانەی شۆڕش) ئیتر مێژووی شۆڕشەکانی کورد هەرچییەك بوویێت پێویستە بە دۆکومێنت بکرێ. مۆزەخانەیەك مێژووی نیشتیمان و نەتەوەشی تێدا تۆمار بکرێت.

## درەختی ریقنە

مرۆڤ تووشی زۆر شت دەبێت لە وڵاتێکدا کە شارەزای نەبێت. شەوێکیان لە شارێکی کوبا چوومە پارکێك هەندێك تاریکبوو. لە پارکەکە کۆمەڵێك خەڵك دانیشتبوون. لام سەیربوو ئەو خەڵکە لەسەر ئەو کورسیە درێژە دانانیشن، کە لەژێر درەختێکدا بوو. منیش چومە سەر ئەو کورسیەو دانیشتم، کتوپڕ ڕیقنەباران کرام لە لایەن کۆمەڵێك کۆتری سەر درەختەکە کە تەنیا درەخت بوو لەو پارکە بچوکەدا و هەموو کۆترەکان لەسەر ئەوێ نیشتبوونەوە.

## کارلۆس فۆنسێکا، هاورێکەی گیڤارا

کوبا لە مێژووی خۆیدا زۆر بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی بە خۆیەوە بینیوە. باتیستا دوا فەرمانڕەوای کوبا بوو هەتا سەرکەوتنی شۆڕش بە سەرۆکایەتی کاسترۆ و گیڤارا. لە کوبا کەسایەتی (خۆزامارتی) بەناوبانگە وەك چۆن لە نیکاراگوا (ساندینۆ) بەناوبانگە. لە هەر وڵاتە زۆرجار کەسایەتییەك لە بزوتنەوە رزگاریخوازو مێژوەکەیدا بەناوبانگ بووە. لە مێژووی گەلاندا سەرکردە دێت و دەڕوات بەڵام گرنگ ئەوەیە چ فکرو فەلسەفەو ئایدیاو مێژوویەك لە دوای خۆی جێدەهێڵێت بۆ نەوەکان. فرۆکەخانەکەی (هاڤانا)ی



پایتەختیش بەناوی فرۆکەخانەی (خۆزامارتی) ناونراوە. سەبارەت بە کەسایەتی خۆزامارتی کتێب زۆر نووسراوەو خۆشی نووسینی هەیە. نیکاراگواییەکان زۆر شتیان لەکوباییەکانەوە وەرگرتووە وەك فکرەی ڕێکخراوی جەماوەریی. بۆ نموونە ڕێکخراوی (CDS) کە لە کوبا پێی دەوترێت (CDL). کەسایەتی (کارلۆس فۆنسێکا) کە یەکێکبوو لە کەسایەتییە شۆرشگێرو ناودارو ئەندامی مەکتەبی سیاسی (FSLN)ی بەرەی ساندینیستی نیکاراگوا زۆرجار لە کوبا بووەو لەگەڵ کاسترۆ دواوەو هاوڕێیەکی نزیکی گیڤارا بووە. لە ئەزموونەکانی گیڤاراو شۆڕشی کوبا زۆر شتی وەرگرتووە (کارلۆس فۆنسێکا) هەروەك کەسی گیڤارا کوژرا. دوای ئەوەی دەکەوێتە کەمینەوە تادوا گولله شەڕ دەکات و بە برینداری دەگیرێ و دوایی دەیکوژن. لەبەردەمی کۆشکی نیشتیمانی گۆڕێکی ڕەمزیی جوانیان بۆ کردووەو ڕازاوەتەوە بەشێوەیەکی هونەری بەناوی (کارلۆس فۆنسێکا).

## سەرنجە گشتییەکانم لە کـوبا

بە پێچەوانەی نیکاراگوا بە دەگمەن وێنەی عیسا لە کوبا دەبینراو سەردانی کلێسە کەمە. بەڵام بەپێچەوانەوە وێنەی گیڤاراو کاسترۆ زۆر هەڵواسراون بەڵام هەتا وێنەیەکی فیدڵ کاسترۆم دەبینی زۆرتر وێنەی گیڤارام دەبینی. گیڤارا بۆتە سمبولێ لەنێو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازەکانی جیهانیشدا. نەك لە ماڵەکاندا لە دوکان و کارگەکانیشدا هەبوو بەڵام وێنەی خۆزامارتیش دەبینرا. ڕۆژنامەی ناوەندی لە کوبا بریتیە لە ئۆرگانی ڕەسمی پارتی کۆمۆنیستی کوبا (گرانما) هەروەك نیکاراگوا زۆر دەربارەی ئەمریکای لاتین دەنووسن.

## کاسترۆ و کەناڵە تەلەڤزیۆنییەکانی کوبا

ئەو کاتەی من لەوێ بووم تەلەڤزیۆنیان تەنیا دوو پرۆگرامی ناوەندی بوو بەڵام زۆر لەوەی نیکاراگوا باشتربوو. فیدل کاسترۆ هەرچەندە قسەکەرێکی باش و لێهاتووە، بەڵام بە چەندین کاتژمێر تەلەڤزیۆنەکەی بۆ قسەکردنی خۆی داگیرکردبوو ئەوەش بێگومان خۆی لە خۆیدا نیشانەی دیکتاتۆریەتە. مرۆڤ هەرچەندە ڕۆشنبیریش بێت و زاناو قسەکەری باش بێت، بەڵام کە بەردەوام زۆر قسەی کردو بە چەندین کاتژمێر مرۆڤ چیتر گوێی لێناگیرێت.



